

چاپی یەکەم
2011



# HAMİŞE LEGEL TODA

ڕۆمان

# هەمیشە لەگەڵ تۆدا

فەهیمەی رەحیمی
وەرگێڕانی: محەممەد حەسەن پور

فەهیمەی رەحیمی

# هەمیشە لەگەڵ تۆدا

رۆمان

"سالوومە" بیرەوەر"

وەرگێڕانی: محەمەد رەسوڵ حەسەن پوور

چاپی یەکەم

٢٠١١

فهیمه رەحیمی، ١٣٣١
هەمیشە لەگەڵ تۆدا، ڕۆمان/ فهیمه رەحیمی، وەرگێڕانی: محەمەد ڕەسوڵ حەسەن پوور ،
کوردستان، سلێمانی، ٢٠١١
ناوی کتێب: هەمیشە لەگەڵ تۆدا
زنجیرە (٢٨٩)ی بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

**پرۆژەی ١٠٠ ڕۆمان**

**زنجیرە ٥٤**

**هەمیشە لەگەڵ تۆدا**

**لەبڵاوکـــــراوەکـــانی خـــانەی چاپ و پـــــەخشی ڕێنـــما**

چاپی یەکەم، وەرگێڕانی کوردی، سەرپەرشتیاری چاپ: سەلاحەدین بایەزیدی،
دیزاین و بەرگ: فوئاد کەوڵۆسی.
هەڵە بڕی: هەرێم یاسین
شوێنی چاپ: چاپخانەی گەنج، چاپی یەکەم،٢٠١١
تیراژ: ٢٠٠٠دانە
ژ. مۆبایل: ٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣ _ ٠٧٣٠١١٩١٨٤٧

## سڵاو لەیاران!

پەیامی دڵ بزوێنت گەیشتە لام
ماچم کردو نامە سەر دیدەی گریانمەوە
لە ترسی ئەوەی لافاوی ئەسرینم بیشواتەوە
لەسەر دیدە هەڵمگرت ولەسەر گیانم دانا

سڵاو بۆ ئەو برادەرانەی دڵە میهربانەکەیان بوو بەهاندەرم بۆنووسینی ئەم نامەیە بۆ ئەوەی لەگەڵیاندا بدوێم:

کاتێك پاش گەشتێکی چەند مانگە هاتمەوە نووسینگەکەم، لەگەڵ کۆمەڵێك نامە لەسەر مێزی کارەکەمدا ڕووبەڕوو بووم، بەبیرکردنەوەیەك کە نامەکان بەهەڵە لەسەر مێزەکەم دانراونو ئاغای شەهبازی لەنەبوونی من کەڵکی وەرگرتووەو کاری لەسەر مێزەکەم کردووە، نامەکانم لەلایەك دانانو خەریکبوو بەخواردنەوەی قومێك ئاو ماندوێتیم بڕەوێنمەوە، کەچاوم بەپشتی پاکەتی نامەکان کەوت. نامەکەم هەڵگرتو بەخوێندنەوەی بۆم دەرکەوت نامەکان بۆمن هاتوون. پەرداخەکەم لەجێگەکەی داناو بەهۆگرییەوە یەکەم نامەم کردەوە، خوێندنەوەی نامەیەك کەدارماڵ بوو لەمیهرەبانی، نارەحەتی لەجەستەم رەواندەوە، بۆ ئەوەی نامەکانی پێشەوە بکەمەوەو بیانخوێنمەوە. دەربڕینی خۆشەویستی گشت برادەران جووڵاندمیو ئەسرینی شادی هێنایە نێو چاوانمەوە، بەڵام لەبەر

زۆری نامەکان نەمتوانی خۆم وەڵامی هەموویان بنووسمەوە، ویستم بەم هۆیەوە لەمیهرەبانی ئێوەی ئازیز سوپاس بکەم‌و بڵێم:

ئازیزانم! لەوەی کەکتێبەکەم سەرنجی ڕاکێشاون خۆشحاڵم‌و هیوادارم بەلایەنگری هەموو ئێوەی هۆگری کتێبەکەم، بتوانم هەنگاوی زیاتر لەم بارەوە بنێم‌و لەدەربڕینی هۆگریتان بۆ هەرچی باشترکردنی نووسراوەکانم کەڵك وەربگرم‌و بەرهەمی باشتر پێشکەش بکەم.

جێگەی خۆیەتی هەر لەم ڕێگەیەوە داوای لێبوردن لەبرادەرانم لە شارەکانی دیکە بکەم، کەناردنی کتێبم ڕاستەوخۆ لەلایەن نووسینگەوە لەتاران دانابوو. بەڵام سوور دەزانم بەلەبەر چاوگرتنی ئەو لوتفەی سەبارەت بەمن هەیانە سەر لەپەرتووکخانەکان دەدەن‌و کتێبەکە دەست دەخەن.

ڕێگەم بدەن لەوەڵامی ئەو برادەرانەی لەنامەکانیاندا پرسیاریان کردبوو، چەن دەتوانن نامەم بۆبنوسن بڵێم نووسینگەی بلاوکەرەوەی "جکاوك" سندووقی پۆستەی ناوەتە بەردەستم‌و ژمارەکەی لەم بەرهەمەدایە. دەتوانن لەم ڕێگەیەوە پەیوەندیم پێوە بکەن. سوپاسی هاوکاریتان دەکەم چاوەڕوانی نامەی ترتانم.

**فەهیمەی ڕەحیمی**

من لێت هەڵنایەم
لەگەڵ تۆدا بووم،
هەمیشەو لە هەموو جێگەیەک
لەگەڵ تۆدا هەناسەم داوە، بەچاوەکانی تۆ دیومە
هەروەک بەرمن لەڕووح !
زەوی لەئاسمان
درەخت لە هەتاو.
تۆ هۆی ژیانم بوی‌و هەی،
بەچەشنێک بەم هۆیەوە ژیانم کردووە کەبروام پێی بووە
هۆی بوونی من تۆیت.
وەڵامم بۆسەرەتاو دوایی ژیان ئەمەیە:
هەمیشە لەگەڵ تۆدا

# سالوومه

کاتێـك لــه شــوێنی کارەکــەم گەرامــەوە، کــۆڵانم بەشــلووقیو خەماوییەوە بینی، بەدیتنی چەند پیاوێکی سیاپۆش لەبەر دەرگای ماڵی ئاغای سەبووری دڵتابوون، دڵم بەجارێك داچڵەکیو زانیم دەبێ رووداوێکـی نـاخۆش روویـدابێ، لـەکۆتایی کۆڵانەکـەدا دوو هاوسـێ بەیەکەوە گفتوگۆیان دەکرد.

لەسەرخۆ لەماڵی خۆمان نزیك بوومەوە، لەم کاتەدا دەرگای ماڵەوە کرایەوەو دایکم هاتەدەر، ئەویش بەرگی تازیەی پۆشیبوو، بەئارامی پرسیم:

دایکە کێ مردووە؟ دایکم بەگەرووی گیراوەوە وتی:

دایکـی ئاغـای سـەبووری، بەسـتەزمان بـەیانی لـە سـەر بـەرماڵ سەکتەی کردووە.

وتم:

ـ خواعـافووی کـا، ژنێکـی باشـبوو، دایکـم بەجووڵانـدنی سـەری قسەکەمی پشتڕاست کردەوەو وتی:

- زووتر بچۆو جله ڕەشەکانت بپۆشەو ئامادەبە بچینە بەهەشتی زەهـرا [1] "، بـۆ لەدەسـتدانی خـانمی سـەبووری خـەمباربووم، بـەلاّم مەیلم لەچوون بۆگۆرستان نەبوو،هەستم بەما ندوبوون دەکرد، وتم:

نابێت من نەیەم؟ ناو چاوانی گرژکردو وتی:

ئە مەچ قسەیەکە؟ بیرت چۆتەوە خـانمی سـەبووری چەندە لە مردنی باوکتدا ئەرکی کێشا؟ ئێستا بەجێگەی قەرەبووکردنەوەی ئەم قسانە دەکەی؟ لەقسەکەم پەشیمان بوومەوەو وتم:

ڕاست دەکەی، دەرۆم جلەکانم دەپۆشم، کاتێك ئیمافەکە بۆمردنی مەیتەکە ئامادەبوو، هەموو دەرو جیران لەکۆلاّنەکەدا کۆببوونەوە.

کاتێك لەرێگە کەمەیتەکە بەسەرشـانی خـەڵکی گەرەکەکـەوە بـوو، دەنگی گریانی هاوسێکان کەبەدوای تابووتەکەوە بوون، دیمـەنێکی دڵتـەزێنی پێـك هێنـابوو، پیاوەکـان لـە ژنـەکان زۆرتـر بـوون، سـەرو چاوی ئاسەف بەقژی ئاڵۆزەوە زۆرتر سەرنجراکێش بوو، هاوسێکان، زۆریان کەوتبوونـەگریان لەوێـدا، چونکە هـەمووەیانزانی بـە مردنـی دایکی، ئاسەف لەدونیادا بە بێ کەس دەمێنێتەوەو هاودەمێکی نیە.

ئەم دوانە ساڵانێك بوو بەیەکەوە دەژیان و ئێستا دەردی تـەنیایی بۆ ئاسەف تاقەت پروکێن بوو.

سـەبوورییەکان وەك لەقەبەکـەیان میهرەبان و خۆش قەلب بـوون و دژواریەکانی ژیانیان بەچەشنێکی سەرسورهێنەر تێپەر دەکرد.

بـێ وەیبـوون و بـێ دەنگیـان، وشـەی سـەرزاری دەرو دراوسـێکان بوو.

---

[1] گورستانێکی بەناوبانگی تارانە

کەس نەیدەزانی ئەم بنەماڵەیە تا ئەم رادەیە لەگۆشەگیریدا ژیان دەکەن و کەس ناچێتە دیدەنیان، بەلاّم هەڵسوکەوتی میهرەبانی خانمی سەبووری، کاتێك رووبەرووی دراوسێکان دەبووە مایەی رێز دانان بۆیان و هەمولایەك بەدوور لەورد بوونەوە لەکێشەکانیاندا، بەچاوێکی رێزەوە سەیریان بکەن و خۆشیان بوێن.

زۆر باش بیرمە کاتێك باوکم مردبوو ئەو ئاغای ئاسەفە چەندە یارمەتی دایکمی داو لەگەڵ دایکمدا هەوڵی دەدا تا مەراسیمی تازیەی باوکم بەباشی بەرێوە بچێت، ئەوو دایکی تادوارۆژەکانی تازیەکە لەگەڵماندابوون، هەموو دەیانوت، ئەوە وەك کورێکی باوکی لەدەست دابێ، بەنیسبەت باوکمەوە دڵۆزی نواندووە.

ئێستا بەوتەی دایکم کاتی قەرەبوو کردنەوەیەتی، هاوسێکان خەریکی سواربوونی ئەو پاسانەبوون کەبۆ تازەیەکە بەکرێگیرابوون.

من و دایکم ئێستا سوار نەبووین، ئاغای سەبووری هاتەلای دایکم و وتی ((خانمی هەقیقی)) رێگە دەدەن سالوومە بچێ نیشوکاری ماڵەکە بکات؟ دایکم سەیری کردم و وتی:

تۆ لەماڵەوە بمێنەوە تا گەرانەوەی میوانەکان ئامادەبکەی. لەوێ مامەوەو ئەوانیتر سواربوون و رۆیشتن، کاتێك پێم نایە ماڵی سەبووری ماڵەکە چۆڵ بووبوو، تەنیا من و یەکێکی تر لە هاوسێیەکان لەوێ مابووین، هەردوکمان نەماندەزانی لەکوێوە دەستپێبکەین.

لەم کاتەدا دووپیاو بەوتنی وشەی یاالله وەژوور کەوتن و بێ سەرنج دان بەمن و خانمی نەیری، دەستیان بەهەڵواسینی قوماشی

ڕەش ولافیتەکان بەدیدارەکان ودستپێکردنی تازیەکە کرد، ئێوارە داهاتبوو کە پاسەکان هاتنەوە، میوانەکان دابەزین، هەموویان هاتنە ماڵەکەو میوانداری دەستیپێکر، پیاوەکان چوونە قاتی خوارەوەو خانمەکان چوونە قاتەکەی ترەوە، بۆمن وخانمی نەیری هاموشۆکردن بەقادرمەکاندا ناخۆشبوو، جێبە جێکردنی فرمانی خانمێکی بەساڵاچوو کەپەیتاپەیتا ئەمری دەکرد، زۆری تووڕە کردبووین.

دانیشتبوو وەك خاوەن ئیشێك کەفرمانی بەکرێکارەکانی دەدا، فرمانی دەدان بەمن و خانمی نەیری. چەند جارێك ویستم فرمانەکەی جێبەجیٚ نەکەم، بەلاّم کەوتمە بیری چاکەی خانمی سەبوورییەوەو پەشیمان بوومەوە، هاوسێکان بۆخۆیان میوانداریان دەکردو سەبارەت بەمەراسیمی کفن ودفن وچاکەی خانمی سەبووری بیرەوەرییەکانی دەدوان. لە هەلێکی بچووك کەدەستم کەوت لەلای دایکم دانیشتم و بە ئارامی لێم پرسی:

دایکە! ئەم ژنە لەخۆباییە کێیە، تەنیا فرمان دەدات؟ دایکم گۆشەی جارشێوەکەی هێنایە بەردەمی بۆ ئەوەی کەس نەیبیستێت و بەهێواشی لەبەرخۆیەوە وتی:

ئەوە پووری ئاغای سەبوورییە، وتم:

هەرکەس بیٚ، بەچەشنێك ئەمر بەسەر من و خانمی نەیری دا دەکات، وەك قەرەواشی بینیبیٚ، من ئیتر ماندووبووم و دەچمەوە بۆ ماڵ. دایکم دەستیگرتم و وتی: ئەمکارە مەکە، خۆ لەبەر ئەو لێرەنیت. مەگەر ئاغای ئاسەف چۆن داوای کرد، بەرپرسیارێتی

ئەمكارە بكەی لە بەر ئەوو دایكی لێرە دەمێنین، هێندەی نەماوە.
وتم:

قەت سەرنجت داوەتە ئەوكچە لەخۆرازییەی لەپەنای دانیشتووەو خۆی باوەشێن دەكات؟ ئەگەر كچە پووری ئاغای سەبوورییە بۆیارمەتیمان نادات و خۆی بەمیوان دەزانێت؟ ئەو پێویستبوو زیاتر بۆپاراستنی ئابرووی ئاغای سەبووری لەهەوڵدا بێت، دایكم دەستی گوشیم و وتی:

وابزانم بەینیان لەگەڵ ئاغای سەبووریدا تێكچووەو بەناچاریش هاتوونەتە ئەم تازێیە. یەكێك لەهاوسێكان سەری هێنایە بن گوێم و وتی:

ئاغای سەبووری ئیشی بەتۆیە، هەستام و بەپلیكانەكاندا چوومە خوارەوە، كاتێك چاوم پێی كەوت تورەییەكەم بیرچۆوەو بوومەوە ئەو سالوومەیەی بۆ یارمەتیدان هەڵبژێردرابوم. ئاغای سەبووری پلیكانەیەك هاتەسەرەوەو بەدەنگێكی مەحزوونەوە وتی:

ماندوونەبی، دەزانم كەوتوویە زەحمەتەوە، وتم:

ئەم قسانە مەكە، دایكت هەقی زۆری بەگەردنی ئێمەوە بوو. ئاغای سەبووری سەری داخست و وتی:

بەم حاڵە، سوپاست دەكەم. ویستم لێت بپرسم لەقاتی سەرەوە هیچمان كەم نیە؟ وتم:

نا،هەمووشتێك تەواوە، وتی:

تكات لێدەكەم ئاگات لەپوورم بێت، نامەوێ بەنارەحەتیەوەلێرە بروات. بەگاڵتەوە وتم:

ئـەو زۆر بـەجوانی بـەخۆیو کـچەکەی رادەگـات. خـاتر جەمبـە. شێوەی قسەکردنەکەم جۆرێکبوو بزەیەك بكات بڵێت:

ئاوایە ئیتر، وتم:

هەرچـی لەدەسـتم بێـت بۆرازیبـوونی ئـەنجامی دەدەم، دیـسانەوە سوپاسیكردو من چوومەوە بۆسەرەوە، کە بینیم پوور خانم خـەریکی پاککردنی خە ياربوو. سەرنجمدا بزانم خوێدانی لایە یاخود نا،

نەمدەویـــست بردنـــی خۆیـــدان وەك فرمـــان ئـــەنجام بـــدرێت، بەخۆشییەوە خۆیدانەکەی لەبەرداستابوو، فرمانێك نەدرا.

خـانمی نەیری بەر پرسـی چا هێنـان بوو، کاتێك بەسینیە چاوە هاتە ژوورەوە بەئارامی وتم:

لەپێشدا بیبە بۆلای پـوورە خـانم نابێـت نارەحـەت بێـت! نـەیری بزەیـەکی کـردو سـینیە چایەکەی لـەپێش راگـرت، کاتێـك بـۆ جـاری دووەم بانگکرام، لای پلیکانەکان لەجێگەی ئاغای سـەبووری پیاوێـك خەریکی بەخێر هێنانی میوانەکانی قاتی خوارەوە بوو وتی:

رێوکە بۆدانانی نانی شەو ئامادەبکەن، جارێکیتر گەرامەوە رێوکە، ئەمجارەیان دوو ژنی تریش هاتن بۆیارمەتیدانو هەرچوارمان بەنانی میوانەکانەوە سەرقاڵ بووین.

ئـــاخری شـــەو کاتێـــك هـــەموویان رۆشـــتنو تـــەنیا هێنـــدێ لـــە دراوسێکان مابوون دایکم رووی تێکردمو وتی:

وادیـارە هیـچکام لـەخزمو کەسـوکاری خوالێخۆشـبوو لێـرەنین، واهەسـتەکەم ئـەوان لـەبری ئـەوەدانانی مەراسـیمەکە بـەرێکوپێکی بەرێوە بچێت.

خانمی نەیری قسەکەی پێ بڕیو وتی:

منیش دیم چۆن پشتە چاویان تەنك دەکەن، لەم کاتەدا ئەمویست بڵێم، خانم بۆپشتە چاوت تەنك دەکەی، مەگەر من خاوەنی تازیەکەم، بەڵام لەبەر ئەوخوالێخۆشبووە هیچم نەوت.دایکم وتی: ئیشێکی باشت کرد، ئێمە کارمان بەکێشەی خزمەکانی ئەوخوالێخۆشبووەوە نیەو هەموومان لەبەرخاتری خودی خانمی سەبووری لێرەین، کەوایە وەرن یارمەتی یەکتر بدەین هەتا زیەکە بەشێوەیەکی باش بەڕێوە بچێت.

مـن بـەزەییم بـەئاغای سـەبووریدا دێـت. خـوا هـەڵناگرێت هـەم سەفیان بکات هـەم ئابروش بـڕوات. خـانمی سالاری قسەی دایکی پـشت راسـت کـردەوەو ژنـانی هاوسـێ ئیـشەکانیان لـەنێوان خۆیـان دابەشکردو بەمجۆرە ئەرکی منو خانمی نەیریش سوکتربوو. ئاغای سەبووری کە بۆبەرێکردنی میوانەکان لـەدەرەوە بـوو هاتـەوە ژوورو بەشەرمو خۆشییەوە سوپاسی هەموانی کرد.

ئەوشـەوە ئاغـاو خـانمی سـالاری کەبەسالاچـووی کوچـەکەبوون لەویمانـەوەو ئێمـە گەڕاینـەوە بۆماڵـەکانمان. بەمانـدویی چـوومە ناوجێگە، بەڵام قسەکانی دایکەو هاوسێکانیتر بردبویانمە ناوفکرو خایاڵاتـەوە، بێئـەوەی بـەخۆم بـزانم بـەزەیم بـەئاغای سـەبووریدا دەهات. ئەودەستو پێ سپی نەبوو، مرۆڤ لەبـەر بێ ئەزمونی سگی پێ بسووتێ. بەڵام تـەنیایو ئەوەی کەناچارە بەتـەنیا کۆڵێك کێشە بەکۆڵیـدا بـدات. مرۆڤـی ناچـار دەکـرد یارمـەتی بـدات. ئـەوکارەی هاوسێکان ئەنجامیانداو منیش بریارمدا هەرچی لەدەستم بێ بیکەم.

ڕۆژی دوایــی پەیوەنـدیم بەفەرمانگەکەمــەوە کـردو داوای مۆڵـەتم کرد. کاتێك لەگەڵ هاوسێکانی تر پێمان نایە ماڵی سەبووریەوە، بەچاوپێکەوتنمان شادی لەڕوویدا دەدرەوشایەوە،

ڕووی لەدایکم کردو وتی:

دەمزانی ئەرو دراوسێی باشتر لەخزموو کەسووکارم هەن و لەم کاتەدا بەتەنیا نامهێڵنەوە. دایکم وتی:

هەمووومان لەگەڵتاین و بەخۆمانت دادەنێین. هەرچیت پێویستە بیڵێ تاکو ئەنجامی بدەین. سەبووری وتی:

ئەوەندە چاکەتان کردو هاتن، شەرمەندەتانکردم، دایکم وتی:

ئەم قسانە لەولا دانێ و پێمان بڵێ چیبکەین. سەبووری بزەیەکی کردو وتی:

چۆن دوێنێ مەراسیمەکەتان بەڕێوە برد ئەمرۆش هەرئاوا سەربەرزم بکەن،

دایکم وتی:

ئەمە ئەرکی سالوومەو خانمی نەیرییە، بەڵام من و ئەوانی تریش لێرەین ئاسوودەبە. هێندێ میوان هاتن و سەبووری چوو بۆ بەخێرهاتنیان و خانمە میوانەکانیشی بەدایکم سپاردن و هەمووومان چووینە قاتی سەرەوە، قاتی سەرەوە بەرەبەرە پڕبوو بەچەشنێك چەند دراوسێی تر هاتنە یارمەتیدانمان و دەستیان بەمیوانداری کرد،

لەپێش هەموو ناوەکاندا ناوی منیان دەهێنا، هەربۆیە ئیدارەکردنی تازیەی ژنەکان خرابووە سەرشانی من.

لەوەلامدانەوەیەکدا کاتێک لەقادرمەکان چوومە خوارەوە ئاغای سەبوری چاوەروانم بوو کلیلێکی بچوکی بەدەستەوە بوو، کاتێک بینیمی، کلیلەکەی بۆ رادەواشاندمو وتی: بێ زەحمەت دەرگای کەنتۆرەکە بکەرەوەو لەسندوقێکی بچوکدا لەقاتی خوارەوەیە سەفتەیەك پارەم بۆبێنە. کلیلم وەرگرتو هەروەکو وتبووی پارەکەم هەڵگرد، دەمەویست دەرگای کەنتۆرەکە بکەمەوە چاوم بەوێنەیێك کەوت لەسەر پێست وێنە کرابوو. سندوقەکە لەسەربەشێکی وێنە کەبوو. سندوقەکەم بەئارامی هەڵگرتو بەدیتنی وێنەکە داچڵەکیم. وێنەی دەمو چاوی خۆم بوو. بەناباوەرپییەوە جارێکیتر سەیرم کرد. ئەوجلەی لەبەر وێنەکە کرابوو، بەشێك لەکراسەکەی کەیەخەی چنرابوو، نیشان دەدا. هەناسەم گیرابوو نەمدەزانی وێنەی من بەلای ئاغای سەبوورییەوە چی ئەکات. بەبیستنی دەنگی دایکم کە وتی: لەنێو کەنتۆرەکەدا بەشوێن چیدا دەگەرێی؟

بەپەلەوێنەکەم لەجێگەی خۆی دانایەوەو دەرگای کەنتۆرەکەم داخستەوەو وتم:

هاتم پارە بۆئاغای سەبووری بەرم، بەپەلە لەژوورەکە هاتمەدەرەوە بۆئەوەی دایکم هەست بەتێکچوونم نەکات، ئیستیکم کرد بۆئەوەی هەناسەیەك بدەم تازۆر ئاسایی لەگەڵ سەبووریدا بەرەو رووبم. لەسەرەوەی بلیکانەکانەوە سەیری خوارەوەم کردو ئەوم بینی کەچاوەروانی منی دەکرد، هەناسەیەکی قووڵی ترم هەڵکێشاو بەئارامی هاتمەخوارەوە. پارەکەی لەدەستم وەرگرتو پاش سوپاس چووە ژوورەکە.

بینینـی ئـەم وێنەیـە بـیرو فیکـری جـۆراو جـۆری هێنایـە نـاو مێـشکمەوە، کـە هـیچ کامیـانم پـێ مـەنتیقی نـەبوو، حـەزم دەکـرد بچمەوە ماڵو بەتـەنیا، بیرم لەم مەسەلەیە بکردایـەوە، لەبەر ئـەوەی لەم حاڵەدا فیکرم بەباشی ئیشی نەدەکرد، فیکرم پەرێشان بوو بوو، بەچەشنێك خانمی نەیری چەند جار هۆی پەرێشانییەکەی پرسیو من هەموو جارێك داوای لێبووردنم دەکرد.

هـەرجۆرە لێکدانەوەیـەکم لەسـەر وێنەکـە هـەبوو جگـە لـەوەی کەسەبووری بیری لـە بارەی منـدا هـەبێت. تەنانـەت بیرلێکردنەوەشـی بەخەیاڵمـدا نـەدەهات. ئـەوپیاوە هەمیـشە سـەری لەبـەر خـۆی نـاوەو سـەیری کـەس ناکـات، بەتایبـەتی لەگـەڵ ئافرەتـدا. ئاخ،نـا، ئەمـە بیرێکی پروپوچە.

لە وانەیە وێنەی سەرچـەرمەکە بە هەڵکەوت وەك من دەرچوبێتو هیچ پەیوەندیەکی تر لە نێوان منو وێنەکەدا نـەبێت. ئەگەر وابوایـە ئاغای سـەبوری بەدڵنیاییـەوە کلیلەکەی نەدەدایـە دەستم، لەوانەیـە نـەیزانیبێ چـاوم بـە وێنەکـە دەکـەوێت؟ ئایـە دەکـرێ لەبـەر ئـەو ناخوشـــییەی بەســـەری هـــاتووە ئەمـــەی فـــەرامۆش کردبێـــت؟ لـــە بیرکردنـەوە مانـدوو بـومو بـە خـۆمم وت، چـی دەبـێ بـاببێ، بـەم بیرکردنەوەیـە هەوڵمـدا سـەبارەت بـەم شـتە بیرنەکەمـەوەو دەسـتبە ئیـشەکەم بکەمـەوە، بـەڵام لێـرە بـەم لاوە زیـاتر سـەرنجم دەدایـە هەڵسوکەوتی، بۆ ئەوەی وەڵامەکەم بدۆزمـەوە، بەڵام هەرچیم دەکرد ئاکامێکی ئەوتۆم دەست نەدەکەوت، رۆژی سێهەم کاتی گەرانـەوە بۆ مـاڵ زۆر خـاتر جـەم بـووم، چـونکە لـەو کاتـەی بەتـەنیا لـە گـەڵی

بەرەورووو بووم، تەنیا شتێك كە وتی ئەوەبوو كە داوای لێكردم سەفتەیەكی تری پارە بۆ بێنم، كاتێك ئەمەی وت تەنانەت سەیریشی نەكردم بە خۆم وت. ((لە وانەیە جارێكیان هەڵە بێت بەڵام بۆ جاری دووەم وانیە، ئەو بە دڵنیاییەوە كلیلی كە نتۆرەكەییم دەداتێ لەبەرئەوەی دەزانێت شتێكی بۆ شاردنەوە تێدا نیە،

هەناسەیەكم بە ئاسودەیی هەڵكێشاو كاتێك دەرگای كەنتۆرەكەم كردەوە سەیری وێنەكەم نەكرد. تەنیا پارەكەم هەڵكرتو رۆیشتم، كاتێك پارەكەم دایە دەست وتی: ژمێریارێكی باشی. وتم:

مەمنوونم، بەڵام ئەوەی بزانە لە پارەكانت سەفتەیەك زیاتری لێ نەماوە، بزەیەكی كردوو وتی :

خەم مەخۆ ناتەواویمان نابێت، مەراسیمەكە بەباشیو ئابرومەندانە بەرێوە چوو. هەر ئەم شەوە بە یارمەتی دراوسێكان ماڵەكە خاوێن كرایەوە، ئاغای سالاریو هاوسەرەكەی داوایان لێ كرد، شەو بەتەنیا نەبێتو بچێتە ماڵی ئەوان، بەڵام ئەو پەسەندی نەكردوو حەزی دەكرد بە تەنیا بێت، بە یانی رۆژی دواتر دایكمو خانمی نەیری چوونە ماڵەكەی بۆ ئەوەی ئەو ئیشوو كارانەی مابوون ئەنجامی بدەن، منیش چومەوە شوێنی كارەكەمو هەمو شتێك گەڕایەوە سەر دۆخی جارانی.

بە مردنی خانمی سەبوری دەرگاكەشیان داخراو هاوسێكان وتنی جاروباری خانمی سە بورییان لە دەست چوو.

پاش مەراسیمی شەوی حەوتەم، كوچەكە گەڕایەوە سەر دۆخی جارانو هاوسێكان بەرە بەرە ئەو پیاوەی بەتەنیا دەژیا، فە

رامۆشیان کرد. هەمویان دەیانزانی پیشەی ئاغای سەبوری عنتیکە ناسییەو لەوانەیە ژیان لە پەنا شوێنەوارە دێرینەکاندا ئەم کەسایەتیەی دابێت بەئەو بۆ ئەوەی لە گۆشە گیریو تەنیاییدا ژیان تێپەر بکاتو خۆی لەخەڵکی بەدوور بگرێت.

لەم ماوەیەدا کە مەراسیمی یادی خانمی سەبوری بەڕێوە دەچوو هەستم دەکرد پێم ناوەتەماڵێکەوە کەشو هەوای سەدەکانی دێرینی هەیە، سەیرکردنی کەلوپەلی دێرینو شێوەی ڕازاندنەوەی ماڵەکە خۆی لەخۆیدا ئەم هەستەی بە مرۆڤ تەڵقین دەکرد، لەم هەستەی لە دەروونمدا پێکهاتبوو خۆشحاڵبومێ حەزم دەکرد لە بێدەنگیو تەنیای ماڵەکەدا دانیشمو سەیری ئەوەی دەگەڕێنەوە بۆ دێر زەمان بکەم، شەوانە کە دەچومە نێو جێگەکەمەوە بیرم دەکردەوە مرۆڤ ناتوانێت بێ ڕابوردوی خۆی ژیان بکاتو زنجیرێکی نادیار دەیباتەوە بۆ ڕابردوو.

حەزمدەکرد جارێکی دیکە پێ بنێمە ئەوماڵەوەو لەنزیکەوە شتەکان لەمشت بکەم،

بیرمە لەوچەند ڕۆژەی لەماڵی سەبووریدا بووم لەگەڵ ماڵەکەدا راهاتبوومو وام بیردەکردەوە دەست لەهەرچییەك دەدەم کۆنو مێژوویە نابێ کاریان پێبکرێ، پەرداغو سوراحی بلور لەبەرچاوم سەیر بوون. بە واسواسییەوە دەمدانەدەست خەڵکیو تەنانەت رامدەسپاردن ئاگایان لەشتەکان بێ، بۆئەوەی زەرەرێکیان پێ نەگات. بەڵام کەمەراسیمەکە دوایی پیبهات، لەم ماڵەدا دەتگوت منیش لەرابووردوم جیابوومەوە. ڕۆژێکی بەیانی کاتێکی دەچوومە

شـــوێنی کارەکـــەم، لەشـــەقامەکەدا دیـــم کەچـــاوەروانی ماشـــێنی ئیدارەکـەی بـوو. منـیش چـاوەروان بـووم، بـەینمان کـەمێك زۆربـوو، نـەمان دەتـوانی بەیەکـەوە بـدوێین. ماشـێنەکەی مـن زوتـر هـاتوو سواربووم.

کاتێـك بەلایـدا تێپـەریم سـەیرم کـرد. بـەڵام ئـەو سـەیری لایـەکی دیکەی دەکردو چاوی لەمن نەبوو. وام بیرکردەوە کەچاوی کز بووە. بێئەوەی بەخۆم بزانم زگم پێ سووتا.

لەمکاتەدا کەوتمە بیری ئەوەوە کـەکێ خۆراکی بۆئامـادە دەکات و ئیـشوکارەکانی بـۆ ئـەنجام ئـەدات؟ بـەخۆم وت ((ئێمـەی مـرۆڤ بەشـێوەیەك کـاتێ هاوکـاری یـەکتر دەکـەین و پاشـان فەرامۆشـی دەکەین و نازانین لەپاش ئەوە چی بەسەر دێت.

لەوانەیـە بـەم کارەمـان ویـژدانی خۆمـان ئاسـودەبکەین و بـەم بیرکردنەوەیـە کـە هـەنگاوی یەکـەممان هاویـشتووە، شـەوێك بەئاسودەییەوە سەردەنێینە سەر سەرین.))

بیرم کەوتـەوە کاتێـك بـاوکم نەخۆش و لەماڵداکـەوتبوو، هـیچ کـام لـەخزم و کەسـەکان نەدەهاتنـە سـەردانی، بـەڵام کـەمرد، ماڵەکـە پـڕ لەخـەڵك بـوو، تەنانـەت ئـەوانی دووراودور باوکمیـان دەناسـی لەمەراسـیمی تازیەکـەدا بـەژداربوون. بـەڵام دوایـی مەراسـیمەکە دیـسانەوە بەتەنیامایـنەوەو کـەس نـەهات بزانێـت دوایـی مردنـی گەورەی ماڵ، ژیانمان چۆن تێپـەردەبێت. ئەگەر من نەمخوێندبایەو لەدایرەکـەدا کـارێکم نەکردایـە، نەمـدەزانی چ چارەنوسـێك لەچاوەروانی من و دایکم دایە.

سەیرمکرد خۆشمان هەر ئەوکارە ئەنجام دەدەین کەخەڵکی دەرحەق بەئێمە کردوویانە. بەخۆم وت:

((دایکم هەمیشە باسی بێوەفایی مرۆڤەکان دەکاتو دەڵێت ئەوەی بیر لەژیانی خۆی دەکاتەوە سەرنجی خەڵکی نادات. ))بەژداریکردن لەبۆنەکانی بوك گواستنەوەو تازیەشدا هەربەم هۆیەوەیە، ئەگەر بۆ زەماوەندێك بانگدەکرێیت، لەبەرئەوەیە ساتێك بەدوور لەئیشوکاری خۆش راببوێرین، ئەگەر لەتازیەدا بەژداردەبین لەبەرئەوەیە کەساتێك بکەوینە رۆژی رابوونو دەڵێی ئەم دونیایە وەفای بۆکەس نیە. ئەی بۆ رۆحمان دێتە سەرلێوان لەهەوڵداندا‌ینو پشویەك نادەین؟ هیچ کەس بەم نیازە کە کێشەکان کەم بکاتەوە لەمەراسیمەکاندا بەشداری ناکاتو بەخاوەن تازیەکە ناڵێ تائەوکاتەی دێیتەوە سەرخۆ لەگەڵتادەبم. هەموو کێشەیەك بەپارە چارەسەرنابێت. هەر کەبنەماڵەی تازییەکە بینیان خەڵکی میهرەبانییان لەگەڵدا دەکەن کەمێك لەخەمەکانیان کەمدەبێتەوە، ئەمە باشترین یادەوەرییە.

ئێمە تەنیا بۆ میوانداریيەکە لەگەڵ ئاغای سەبووریدا بووین، بۆ ئەو بەلآیەی بەسەریدا هاتبوو هیچمان نەکرد، لەکاتێکدا پێویستبوو پاش ئەو هاودەردییە لەگەڵیدا بوونی خۆمان بسەلماندایە.

کاتێك لەفەرمانگە دەرچووومو هاتمەماڵەوە، ئەم فیکرەی لەبەیانییەوە سەرقاڵی کردبووم لەگەڵ دایکمدا هێنامە گۆڕیو بەپەژارەوە وتی:

گەردەتانەوێت رووحی خانمی سەبووری ئاسوودەبێت یارمەتی جێماوەکەی بدەن دایکە چووە ناو فیکرەوەو وتی:((ڕاستدەکەی،

پێویستە بیرێکی لێبکەینەوە.))و لەژوورەکە چووەدەرێ. هەرئەم شەو دایکم لەگەڵ چەند هاوسێدا چوون بۆ چاوپێکەوتنی ئاغای سەبووری، منیش لەگەڵیاندا بووم، حەزمدەکرد بۆ جارێکی دیکەش لەنزیکەوە بچوومایە نێو دونیای رۆیشتووەکانەوەو خۆم لەرابردودا دیبایەوە. ئاغای سەبووری بەڕویەکی خۆشەوە هات بەرەو پیرمانو دایکم گلەیی لێکرد، بۆخۆی لەهاوسێکان بەدوور دەگرێت؟ ئەو بزەیەکی هاتیو وتی:

هێندە خەجاڵەتی چاکەی ئێوەم نازانم چۆن قەرەبووی بکەمەوە، هەربۆیە لەخۆم رانەدەدی لەگەڵ ئێوەو هاوسێکانی باشمدا رووبەرووبم. ئاغای سالاری وتی:

ئێمە چاوەروانبووین لانیکەم وەڵامی سەردانەکەمانتت بدایەوەتەوە وات نەکرد بۆیە خۆمان تین. هەرچەندە دووریمان لێبکەی، ئێمە خۆشمانەدەویی‌و دێین بۆدیدەنیت، سەروچاوی سەبووری گەشبووەوەو وتی:

من هەمووتانم خۆشدەوێت، تەنیا نامەوێ ببمە هۆی بارگرانیتان. نازو گلەیی دەستی پێکردو من لە دەموچاوی سەبوریدا ڕازیبوونو شادیم بەدی کرد،

ئاغای سەبووری هەستاو وتی:

چەند دەقیقەیەك بمبوورن، ئاغای سالاری دەستی گرتو وتی:

تکایە دانیشە، ئێمە هاتووین چاومان بە خۆت بکەوێتو چاوەڕوانی میوانداری نین، سەبووری وتی:

کـارێکی ئـەوتۆ ناکـەم، چـاییم بـۆ خـۆم لێنـابوو، رێگـەم بـدەن پیاڵەیەکتان بۆ بێنم، هەستامو وتم:

من ئەم کارە دەکەم، سوپاسیکردو وتی:

ئەمە چاکەی تۆ دەگەیەنێت. چوومە مەتبەخ تا ئەو هەلومەرجەی دەمویـست پێیبگـەم. کاتێـك هـەنگاوم نایـە مەتبەخەکـە، شـتە دێرینـەکانم بەرچـاو نەکـەوت چـام بـۆ هـەمویان تێکـردو هێنـام بـۆ ژوورەکەوە، وام بەبیردا هات کەشوهەوای ماڵەکە گۆڕاوە، بێ ئەوەی بە خۆم بزانم وتم:

دیکۆرەکەت گۆڕیوە؟ پرسیارەکەم بوو بە هۆی ئەوەی ئەوانیتر بە سەرنجەوە سەیری ژوورەکە بکەن، سەبووری سەری بزاوتو وتەکەی پشتڕاست کردەوەو بە دوایدا وتی: هەندێك لە شتە بەهادارەکانم لە ماڵ بردۆتەدەر، وتم:

زانیم، لە بەر ئەوەی نەمدەتوانی لەگەڵ ڕابردوودا پێوەندی بگرم. قسەکەم بوو بە هۆی سەرسوڕمانیو بۆئەوەی ئەوانیتر بە شێتم نە زانن وتم:

سـەیرکردنی کەلوپـەلی دێـرین بنیـادەم دەگەڕێنێتـەوە بـۆ دێـر زەمـانو مـرۆڤ هەسـتدەکات لـە ڕابـردوودا دەژیـتو پێوەنـدی بـەو چاخەوەیە، ئاغای سەبووری وتی:

گە ر بمزانیایە ئەو شتانە خۆشحاڵت دەکات قەت ئەم دەبردنە دەرەوە، پاش مردنی دایکم بەباشم نەزانی لەماڵەوەدا ڕایانگرمو بە ئەمانـەت دامـن بـە بـرادەرێکم، ئاغـای سـالاری کارەکـەی پـشتڕاست کردەوەو خانمی نەیری وتی:

پێویـسته فکرێکـی سـەرەکی بکەیتـەوە بـیری هـەموانی بـۆ لای ژنهێنـانی سـەبووری ڕاکێشا، ئاغـای نـەیریو هاوسـەرەکەی سەیری یـەکتریان کـردو پێیـا وابـوو هێنانـە بەرباسـی ئـەم مەسـەلەیە هێشتا زووە. سـەبووری دەسـتیکرد بـە کـۆ کردنـەوەی پیاڵـەکانو کاتێك لـە ژوورەکە چووە دەرەوە ئاغای سالاری وتی:

گـشتمان بـۆ دانـانی پێـشنیازێك هـاتووین، بـەڵام ئێـستا باسمان نـەکردوە، وا باشـترە یـەکێك لـە خانمـەکان باسـی بکـات، کـە ئاغـای سەبووری هاتەوە ژوور دایکم سەری باسەکەی کردەوە وتی:

ئاغای سەبووری ئێمە هاتووین پێشنیازێکت بۆ بکەین، هەموومان دەزانـین تـۆو دایکـت بەیەکـەوە دەژیـانو تـۆ دوای دایکـت بـە تەنیا ماویتـەوە، ئێـستا بـە نیـازین کـاری دایکـی خوالێخۆشـبووت ئێمـەو هاوسێکان ئەنجامی بدەین.

ئەگەر ڕێگە بدەیت ڕۆژێ یـەکێك لـە ئێمـە خواردنەکەت را بکاتو ئیشوو کارەکانت بۆ بکات، ئاغـای سـەبووری بەناڕازیبونـەوە سـەری جولاندو وتـی: نـا، تکاتـان لێدەکـەم خۆتـان زەحمـەت مـەدەن، ڕاستە دوای مردنی دایکم بەتەنیا ماومەوە، بەڵام خۆم دەتوانم ئیشووکاری ماڵێ ئەنجام بدەم، لێتا ن مەمنونم،

ئاغای نەیری وتی:

دەزانین دەتوانی بەڵام ئەوەی قبوڵ بکە هەر کە سێ کاتێ ماندووەو لە ئیشەکەی دەگەڕێتەوە پێویستی بە خـواردنو پشووودان هەیە. با هاوسێکان یارمەتیت بدەن.

ئاغای سەبووری دیسان نارەزای دەربڕیو وتی:

نا هەر ئەوەندە کە میهرەبانیم لە گەڵدا دەکەن‌و دێن بۆ دیدەنیم کافییە لەمە زیاتر شەرمەندەم مەکەن، قسەکانی خانمی نەیریش بێ ئاکام بووو ئاخیرەکەی بڕیار درا سەبووری لە گۆشەنشینی بێتە دەرێو هاموشۆی دراوسێکان بکات. ئاغای سەبووریش ڕەزامەندی دەربڕی‌و کۆبونەوەکە دوایی پێهات. ئاغای سەبووری قەراری دانا شەوانی پێنج شەمە بچێتە دیدەنی دراوسێکان‌و بۆ یەکەم میوانداریش ماڵی ئاغای سالاری هەڵبژارد. تاکو گرتنی مەراسیمی چلەی خانمی سەبووری، کورەکەی درێژەی بەم میوانداریییەدا. دواهەفتە سەرەی ئێمەبووکە دەکەوتە شەوی چلەو ئێمە هەموومان میوانی ئەوبووین. لەم مەراسیمەدا بەسەرسووڕمانەوە سەیرم کرد شتەکان گەراونەوە بۆ جێگاکانیان‌و من دیسان توانیم ئەو کەلووپەلانەی هۆگریم پێیانە لەنزیکەوە ببینم‌و لەمستیان بکەم، میوانەکان کەمبوون‌و

پەزیرای بەئاسوودەیی ئەنجامدرا. پاش ڕۆشتنی میوانەکان، سەبووری رووی لەدایکم کردو وتی:

لەمەراسیمی سەری ساڵیش کەمتر لەمە بەشداردەبن. کەئیرادی لێناگرێت سەرقاڵی ژیان‌وگرفتاری خەڵکی مەجالێك بۆبەشداری لەم کۆرانە ناهێڵێتەوە، دایکم وتی:

مرۆڤ تائەوکاتەی زیندووە حەزدەکات بێتە دیدەنی کردنی‌و لێی بپرسن، دوای مردن هاتن ونە هاتن ئیتر چ سوودێکی هەیە. ئاغای سەبووری ئاخێکی هەڵکێشاو وتی:

بەڵی، ڕاستدەکەی. دایکم بزەیەکی کردو وتی:

پێـنج شـەمەی داهاتووسـەرەی ئێمەیـە، بـیرت نەچـێت !ئاغـای سبوری وتی:

ئەگەر نەچووم بۆ راسپێردراوییەك بەدڵنیاییەوە دێم. بەڵام بەیانی رۆژی پێنج شەمە کاتێکی لەماڵ دەچوومەدەر بۆئەوەی بچمە شوێنی کارەکـەم زەنگـی دەرگایـان لێـدا، کاتێـك دەرگـام کـردەوە ئاغـای سەبووریم بینی، پاش سلاّو وچاکووخۆشی وتی:

موزاحیم بووم بۆئەوەی بۆمیوانی ئەم شەو داوای لێبوردن بکەم هەرئەمرۆ دەچم بۆساوو تا دووبا یانی ناگەرێمەوە، ئەوەبوو هاتم ئاگادارتان بکەم،

وتم:

فەیدی چییە ئۆخرتان خێربێت. سوپاسی کردو وتی:

تکایەکم لێت هەبوو قبولی دەکەی؟ وتم:

هەڵبەت، فەرموو. وتی:

دەمەویـست تکـات لێبکـەم ئاگـات لەماڵەکـەم بێـت و چـاوەدێری شتەکان بکەی، بەگاڵتەوە وتم:

تادێیەوە ساتێك چاویان لەسەر هەڵناگرم. پێکەنی و وتی:

خۆزگە منیش بەقەدەر ئەشیاکان کۆن بام، ئەمە کلیلی ماڵەکەیە لەم کاتەوە ئەشیاکان هی خۆتن. کلیلەکەم وەرگرت و وتم:

ئاگـالێبوونی بـەیانان لەسـەردایکمەو کاتێـك ئێـشم تـەواو بـوو گەرامـەوە مـن ئاگـام لێیـان دەبێـت. بەئاسـوودەیی سـەفەرەکەت بکـە. وتـی: بـەبوونی ئێـوە نیگـەران نـابم. کاتێـك خۆاحافیزیمـان کـرد، کلیلەکەم دا بەدایکم و قسەکانی ئاغای سەبووریم بۆدووپاتکردەوە و

بەرپرسایەتی ماڵەکەم بەو سپاردو بەرەو شوێنی کارکەم چووم. ئێواریْ کلیلی ماڵی سەبووریم لەدایکم وەرگرت، بۆئەوەی هەم باخچەکە ئاوبدەم و هەم سەیرێکی ئەشیاکانیش بکەم. کەچوومە ماڵەوە. بێدەنگی دەورەی گرتمو هێندێکیش ترسام. بەپەلە باخچەکەم ئاوداو لەچوونە ژوور پەژیوان بوومەوە،

دەنگێك هێزێك لەجێگەکەم رامدەگرێت، دوودڵ بووم، بەخۆم ووت: ((تەنیا سەیرێکی کوردستان دەکەمو زوو دەگەرێمەوە. )) بەم بیرکردنەوە دەرگای داڵانەکەم کردوەو چوومە ژوورەوە، کاتێکی دەرگای دیوەکەم کردەوە لەناوەراستی دیوەکە مێزێکم بینی، کورسییەکی بچوکی رازاوە لەلای مێزەکە بوو. لەسەرمێزەکە گڵێنەیەکو چەند پیاڵە دەبینرا، بەسەیرکردنیان هەستم بەئارامی کرد. لەسەر کورسیەکە رۆشتمو هەوای دیوەکەم بەهەناسەیەکەوە کردە نێوسیەکانمەوە، بەرەو رووم فێڵێکی دێرین بەدیوەکەوە بوو، لەپەنایدا دەرگایەکی داری زۆر کۆن بەدیوەکەوە درابوو، وام بەبیردا هات فێڵەکە هی دەرگاکەیە کەدەرگاکەم لەمس دەرکرد چاڵوچۆڵەکانی لەژێر فامکافدا هەستیان پێدەکرا چەند پارچە ئاسنی خری وەك تۆپ دەرگاکەیان رازاندبۆوەو رێك بردبومەیە زەمانی زوو، ئەوەی کەوەستای دەرگاکە بەچ زەوق و سەلیقەیەکەوە دروستیکردووە.

وامدەزانی کابرای دارتاش ئەبینم لەکاتی ئیشکردندا نێوچاوانی ئارەقە گرتووی لەژێر تیشکی هەتاودا دەدرەوشێتەوە. کاتیْ بینی سەیری دەکەم سەری بەرز کردەوەو بزەیەکی بۆ کردم، تەوێڵی پر

چرچی باسی تەمەنێکی دوورو درێژ و پڕ سوودی دەکردوو چاوە وردوو درەوشاوەکانی بەلای ئیشەکەیەوە بوو، لەژێر پێمدا وردە دارم بەدی دەکردوو لەترسی ئەوەی نەکا قاچەکانم رۆچن هەنگاوێك کشامەوە، ئیتر نەدەترسام و هەستێکی وەك سەیری بینایەکی دێرینم هەبوو، لەسەرمێزێکی تردا چاوم بەسەیروکالاّوو خرووەدەو شمشێرێکی لەکالان نراوکەوت. رۆستەم و شانامەم بەپێش چاودا هاتن و رۆستەم سواری ئەسپەکەی بەناوی رەخش بوو بوو، دەنگی حیلەی ئەسپەکەی ترساندمی و هەنگاوێك کشامەوە، دیسانەوە چاوم بەگلێنەکە کەوت، بەئارامی لێی نزیکبوومەوەو لەسەر کورسییەکە دانیشتم، توونیم بوو، حەزمدەکرد گلێنەکە پڕ لەئاو بایەو بمخواردایەوەو توونیەتیم بشکابایە.

یەکێك لەپیالەکانم هەلگرت و بۆلای دەمم بردو وام نواند ئاوی تێدایەو دەینۆشم، حالێکی سەرخۆشیم پێداهات، هەردەتگوت شەربەتێکم نۆشیوەو لەحالی ئاسایی دەرچووم، تامی شیرینایی شەربەتەکەم هەستپێکرد، مەیلم بەلای نۆشکردنی پیالەیەکی ترەوە بوو، ماندوییم لەلەشدا نەمابوو، خەو چاوی گەرمکردم و لەسەریەکی دانان.

خەونم دی لەخەومدا لەپشت دەرگاکە بووم، بەدەنگی دەرگا کوتانەکە مێشکم تێکچووبوو، لەبەرئەوەی کەس دەرگای لێنەکردمەوە، ویستم بگەرێمەوە کەلەم کاتەدا دەنگی جیڕەی دەرگاکە، لەسەر جێگەکەم رایگرتم. دەرگام کردەوەو بەئارامی وە ژوورکەوتم، دالأنێکی گەورەی نیوە تاریك، فێنکی هەوای دالأنەکە

هانیــدام هــەنگاوبنێم‌و بــەرەو ڕۆشــناییەکەی دواوە بــچم، لــەدوای دالأنەکـە چـاوم بـەباخێکی پرداروگوڵکـەوت‌و دەنگـی بولبـوی خـۆش خـوان لەسـەر چـڵە بۆیـەکان دەهاتـە بـەرگوێ، لـەناو ئەودرەختانـەی سەریان لەئاسمان دەسوی، ڕێگەیەکبوو بەمەرمـەر سەنگچن کرابوو، دوایەکـەی حـەوزێکی شـین بـوو جووتێـك تـووی جـوان بەئاسـودەیی یـەوە لـەناو ئاوەکـەدا مەلـەیان دەکـرد، لـەم شـوێنەدا دەتگـوت ڕۆژ خـەریکی ماڵئاواییـەو باخەکـە خـۆی بۆهـاتنی مـانگ ئامـادە دەکـرد، درێژی حەوزەکەم پێواو خۆم گەیاندە تـەختێکی شاهانە فەرشکراو، لـەوەی بەشـك بـووم ئـاخۆ بـاخ‌و جوانییـەکانی هـی مـنن یـان نـا؟ لەســەرتەختەکە دانیــشتم‌و ســەیری ئــەو کەنیزانــەم دەکــرد کەبــە پەزێراییــەوە ســەرقاڵبوون، دەموچــاوی هــەموویان وەك هــەتاوبوو، بـەرگی سـپی حـەریریان پۆشـیبوو، کەتەنکییەکـەی ئەنـدامی زیـوینی ئەوانی تێدا دیـاربوو، لـەم کاتـەدا، حیلـەی ئەسـپێکم بیست‌و پاشان سوارێك کەبەپرتاو بەرەو لای من دەهـات، بەبیرم داهـات نامەبەرێکەو دەبێــت راســپاردەیەکی پــێ بێــت. کاتێــك لەئەســپەکە دابــەزی‌و لەبەرپێمـدا کڕنوشـی بـرد، بـەدەنگێك کـەهـی خـۆم نـەبوو، فـرانم پێـدا ڕاوەســـتێ‌و ڕاســـپاردەکەی بڵێـــت، ســـوارەکە وەســـتاو دەســـت لەسەرسنگی وتی:

خاتوونی من ! پێویستە هەرچی زووترە بەرەو قەسر بچی، ئەسیر لەتەنیایی‌و دووریت نەخۆشبووەو داوات دەکات. سووك‌و ئارام وەك خەونێك لەسەر ئەسپێکی سپی سواربووم‌و ڕۆیشتم. لەدەنگی زەنگ ودەرگالێدان هاتمەوە سەرخۆم ولەوەی یەکێك ئاوا لەدەرگا دەکوتێ

تووره بووم‌و هەوڵمدا هەستم و خۆرابگرم‌و پاشان چوم دەرگای حەوشەکه بکەمەوه، کاتێك دەرگام کردەوه بەدیتنی دایکم‌و دراوسێکان کەلە پشت دەرگاکه کۆببونەوه سەرم سوڕما، وتم:

چ شتێك روویداوه؟ دایکم هێندە نارەحەتبوو نەیتوانی قسان بکات‌و پاڵی بەدەرگای حەوشەکەداو لەجێگەی ئەو خانمی نەیری وتی:

ئەتۆ دەبێ بڵێی چ شتێکت لێ قەوماوه، هەموویانت نیوه گیان کردووه، کچێ! دایکم تارادەیەك هاتبۆوه سەرخۆی وتی:

هاتی باخچەکه ئاوبدەی‌و بگەرێیەوه، بەلاّم ئەم ئاودانه چوار سەعاتی خایاند، جاچیت دەکرد؟ سەعات نۆی شەوه، ئێمه زەنگمان لێدا لەدەرگامانـدا دەتگوت کەس لەوماڵەدا نیه، بۆدەرگات نەدەکردەوه؟

سەیرم کرد دراوسێکان هەموو سەیرم دەکەن‌و چاوەڕوانی وەلاّمی من بوون، چیم پێ بوتنایه؟ کاتێك خۆم نەمدەزانی له کوێ دەگەڕێم، بەناچاری وتم:

من تازه هاتوومه ماڵی ئاغای سەبووری، دایکم پرسی:

ئەی له پێشدا لەکوێ بووی؟ درۆیەکم سەریەك خستو وتم:

که لەماڵدەرکەوتم یەکێك له هاوکارەکانم بینی‌و له گەڵیدا چوومه شت کڕین‌و تازه هاتووم باخچەکەی ئاو بدەم، به ڕەواڵەت رازی بوون‌و هەموویان پشویەکی رەحەتیان دا، بۆ ئەوەی ماوەی پرسیارێکی دیکەیان نەدەمێ بەلوعەی ئاوەکەم کردەوەو هەر ئاوا لەماڵەوه دەرکەوتم، ویستم دەرگاکه داخەم، دایکم وتی:

کلیلەکەت هەڵگرتووە؟ وتم:

نا ! گێژتان کردم فەرامۆ شمکرد هەڵیگرم. ئەوانم لە پشت دەرگا جێهێشت و بەپەلە گەڕامەوە ژوورەکە. بیرم بوو کلیلەکەم لە سەر مێزەکە لەلای گڵێنەکە دانا بوو.

چوومە ژوورەکەو بۆلای گڵێنەکە چووم، بۆ ئەوەی کلیلەکە هەڵگرم، بەڵام لەوێ نەبوو. وەستام و بیرم کردەوە، سەرەتای هاتنە ژوورەوە کلیلەکەم لە کوێدا داناوە؟ سەیری ئەو مێزەم کرد کە کڵاوخوودەکەی لە سەر بوو، لەویش نەبوو دەمزانی لە دیوارەکە نەچوومە شوێنێکی تر، کەوایە دەبێت کلیلەکە لە ژوورەکە بێت، بەڵام لە کوێی ژوورەکە؟ نەمدەزانی. جارێکی دی گەڕام و فەرشەکەم سەرەو ژوور کرد، گێژ بووم، لەسەر کورسیەکە دانیشتم بۆ ئەوەی باشتر بتوانم بیر بکەمەوە.

دەنگی دایکم بیست، دەیگوت:

سالوومە ئەرێ چ دەکەی، بۆ نایەی؟ حەزم دەکرد هاوار بکەم و بڵێم، کلیلەکەم گومکردووەو بە دوایدا دەگەڕێم. ئەگەر دایکم تەنیا بوایەو دراوسێکانی لێنەبوایە وام دەکرد، بەڵام بوونی ئەوان لە وێدا دەبووە رێگر کە هاوار بکەم بۆچی، چونکە نەمدەویست ئەوان بە کچێکی گێژوویژم بزانن. بوغز قورگی گرتبووم و هێندەی نەمابوو فرمێسکم لەچاوان بێتەخوار، لە پڕ چاوم بە قفڵە دێرینەکە کەوت، کلیلی ماڵەکەی تێدابوو لە جێگەی خۆم پەڕیم،

کلیلەکەم هەڵگرت و بە پەلە چوومە لای دەرگاکە، دایکم و خانمی نەیری پێکەوە قسەیان دەکرد، دەمزانی ئەگەر قسەیەک بکەم

تووڕەیی دایکم وەك بۆمبێك دەتەقێتەوە، دەرگای ماڵەکەم داخستو زووتر لەوێ بەرەو ماڵەوە چووم. دایکم کەمێك لەمن درونگتر گەیشتەوە ماڵ، بەتوڕەیی سەرپۆشەکەی هەڵدایە گۆشەیەكو پرسی:

تۆ دەزانی چ دەکەی؟ وەك مرۆڤی سەرخۆش و گێژت لێهاتووە. ئەوە باخچە ئاودانەکەت و ئەمەش کلیل هێنانەکەت، هۆشت بەکوێوەیە؟ لەبەرئەوەی وەڵامێکم نەبوو بەناچار بێدەنگبوومو کێشەکە لێرەدا تەواو بوو، بەڵام شەوێ کەچوومە سەرجێگەکەم، هەستم بەوە دەکرد کە پێویستە بچەمە سەفەرێك، سەفەرێکی جادوویی و رۆیایی کەلەراستیدا وێنەی نەبوو، چاوم لەسەر یەکنانو هەستم کرد دەنگی مەلێك دێتە بەرگوێمو گەرمای نیوە شەوم لە لەشمدا هەست پێدەکرد. دەموو چاوی پیاوێکی سوار تێکەڵی شەوقی هەتاو ومانگە شەوبوو، چاوی سەرنج راکێشبوون دەنگی ئارام بوو، دەتگوت بۆ وتنی هەر وشەیەك یارمەتی لەکات دەخوازێت.

خۆزگە خەبەرم نەبایەو لەگەڵیدا بەرەو قەسرەکە چووبام. ئەگەر لەگەڵیدا بچومایە قەسرەوە چاوم بەکام ئەمیر دەکەوت، داخوا ئەویش وەك پەیکەرەکەی جوانو بەهەیبەت بوو؟ لەجێگەکەمدا چینگڵمدا بیرم هاتەوە چوار سەعاتی رێك بەخەونێکی رۆیایی یەوە خەریکبووم وکاتم داوەتە دەس فەرامۆشی، ئایا دەکرا دووبارە ئەم خەونە ببینمەوە؟ بەڵام کلیلەکە چۆن چوبوە نێو قفڵەکەوە؟ من تەنانەت بیرم نایەت کەلەمشتم گرتبێت، ئایا مومکینە، کاتێك دەرگا دارەکەم لەدەست دەگرت کلیلەکەم لەقفڵەکە هاویشتبێ؟ لەوانەیە

کاتێك چاوم لەسەریەك داناون، چوومە گەشت وگەران، لەخەونمدا بەرێگەدا رۆیشتووم و لەم کاتەدا کلیلەکەم خستبێتە نێو قفلەکەوە؟ ئا،بەڵێ! ئەوکاتەی لەدەرگاکەمداوکەس لێی نەکردمەوە، دەشێت هەرئەوکاتە بووبێت. لەبەرئەوەی کاتێك دەرگاکە کرایەوە کەسم نەدی دەرگاکەی لێ کردبمەوە. کەوایە ئەمە کلیلی دەرگای ماڵە رویاییەکەیەو ئەگەر بمەوێت جاریکی دیکە بچمە سەفەر دەبێت قفڵی دەرگاکەبکەمەوە. لەم بیرکردنەوەیەدا ئاسوودەبووم بە ئارامی چاوێکم لێکنا.

رۆژی هەینیم بەنەخۆشییەوە دەستپێکرد. لەشم گران بوو، نەمدەتوانی هەستم. دایکم دوجار بۆ هەستاندنم هاتە پشت سەرم. گەرمای هەتاو ژوورەکەی قورس کردبوو هەڵمژینی هەوای گەرم نەخۆشییەکەی زیاتر کردبوو، دایکم بەو بەهانەیەی کەدەمەوێت لەرۆژی پشوودان بەباشی کەڵك وەرگرم، ئیتر نەهاتەوەلام. بەخەبەربووم‌و چاوم بڕیبوە سەقفی سپی ژوورەکە. بێئەوەی بەخۆم بزانم دەستم کرد بەژماردنی داری خانووەکە، زیاتر لەچوار دارم بۆنەژمێردران. وەنەوزم هاتی‌و ئەسرینی چاوم بەگۆنامدا شۆربوەوە، بەخۆم وت، ((ئەگەرئەوەی دوێنی لەماڵی ئاغاڵی ئاغای سەبووری بینم بۆپزیشکێکی دەروناسی باس بکەم، خەونەکم بەشێتی لێکدەداتەوە))بەوتنی ئەوەی، کیژێکی باریك ئەندام، دەچنە ناو دەروونی خۆیانەوەو خەیالاتن، ریزە داوودەرمانێکی زۆرم بۆدەنووسێت، ناتوانم هیچ بەدایکیشم بڵێم لەبەرئەوەی ئەویش

بەنەخۆشــم ناودەبــات و لەبەرئــەوەی خــووی گرتــووە دەردەدڵ لای دراوسێکان بکات.

زۆر زوو هەموخەڵکی گەرەك دەڵێن سالوومە نەخۆشەو هێندەی نەماوە شێت بێ. کەوایە بۆئەوەی پێشی ئەم رەوشە بگرم واباشترە لێوانم لێکنەکەمەوەو بەتەنیا بەرەوسەفەربچم، دیارە ئەگەرسەفەرێکی تر هەبێ من بتوانم دیسان دەروازەی هەرێمی رۆیا بکەمەوە، ئەمرۆ پێویستە بۆ رۆیشتنم بۆماڵی ئاغای سەبووری هۆیەکی سەلمێندراوی بـۆ بدۆزمـەوە بۆئـەوەی دایکـم نیگـەران نـەبێت و لـەنیوەی رێـی سـەفەرەکە نەمگێڕێتـەوە. بـەلام چـی بڵـێم؟ واباشـترە بڵـێم دەچـمە دیـدەنی هاوکارێکـانم و دەرنـگ دەگەڕێمـەوە، نـا، نـاتوانم لەگـەڵ دایکمدا درۆ بکـەم، جـاری پێشـوش بۆئـەوەی نیگـەران نـەبێت ئـەم کارەم کرد. کەوابوو لەچ رێگەیەکەوە دەتوانم بەئازادی بچمە سـەفەر؟ واباشە بڵێم چەند کاتژمێرێك لـەماڵی ئاغـای سـەبووری ئیشم هەیـە نـابێ کـەس مـوزاحیم بـێ، بـەلام ئەگـەر، پرسـیار بکـات ئیـشەکەت پێویستی بەچەند کاتژمێرە بڵێم چی؟ نا نابێت کەس بزانـێ لەماڵی ئاغـای سـەبووریم. کـەدایکم هاتـە ژوورەکـەم هـەودای بـیرو خـەیالاتم پساو بەرووگرژییەوە پرسی:

هەردەتــەوێ لەنێوجێگــەدابی؟ هەســتە تانــانی نیــوەرۆ ســارد نەبۆتــەوە بیخـۆ، مـن و خـانمی نـەیری دەمانـەوێ بـچینە بەهەشـتی زەهراو تا ئێوارە دانەهاتووە بگەرێینەوە، ئەگەرتۆش دیێ، زووخۆت حازربکە، ئەم هەواڵە بەچەشنێك خۆشحاڵی کردم، بێ ئەوەی هەستی پێ بکەم هەستام لاچاوی دایکم، ماچکردو وتم:

ـا، مـن نایـەم ئێوەبـچن، دایکـم ماچـەکەی بـیٚ وەڵام هێـشتمەوەو ووتی:

کەوایە ئامادەکردنی نانی شەو لەسەرشانی تۆیە. وتم:

خاتر جەم بێت، بەپەلە دیوەکـەم رێکوپێـك کـردو لەسـە رسـفرەکە رۆشـتم، لەخواردنەکـە هـیچ تێنەگەیـشتم لەبـەروەی هێنـد بـە پەلـە خواردم نـەمزانی تـامی چییە، کاتێك خـانمی نـەیری هـات بەشـوێنی دایکمداو ئەوان پێکەوە لەماڵ وەدەرکەوتن، هەناسـەیەکی ئاسـوودەم کێشا. حاجەتەکانم شوشتن‌و کلیلی ماڵی ئاغای سەبووریم هەڵگرت‌و چـوومە دەرەوە، سـەیرێکی کوچـەکەم کـرد، لـەکاتی نیـوەرۆدا کـەس لـەکۆڵان نـەبوو، بـەخۆم وت: ((تـائێواره لەسـەفەردێمەوەو نـانی شـەو ئامـادە دەکـەم.)) بـەم بیرکردنەوەیـە دەرگـای مـاڵ ئاغـای سـەبووریم کـردەوە چـوومە ژوور، بۆیـەك چـرکە دوودڵـی هاتـە نێـو دڵمـەوەو لەئەنجامی کارەکە دەترسام.

بـەڵام بـەم بیرەوە لەوانەیـە سـەفەرێکی تـر لـەئارادا نـەبێت دەرگـام کردەوەو چومە ژوور، هەوای نم گرتـووم بـەبن لووتـدا هـات، دەمزانـی ئەمـە بـۆنی هەوایەکـە ئۆکـسجینی تـری تێدایـەو لـەو ئەشـیایانەوە هەڵدەسـتێت. لەسـەر کورسـیەکە دانیـشتم‌و بەبیرمـدا هـات دوێنـیٚ کامەیـەك لەئەشـیاکانم لەدەسـت گرتبـوو، ئـەمجارە بەهۆشـیارییەوە چـاوم لەسـەر یـەك دانـان، هـیچ گەشـتێك دەسـتی پێنـەکردو تـەنیا ئەسـتێرەی درەوشـاوە بـوون بـەبن پێڵووەکانمـدا دەرۆشـتن، زانـیم جێگەیەك رێگەکەی لەمن کردوە پاشان چوومە لای ئەومێزەی کـلاو خوودەکـەی لەسـەربوو راوەسـتام‌و بیرم هاتـەوە پـێش ئەوەی نزیکـی

مێزەکەبمــەوە پیــاوە دارتاشــەکەم دیبــوو، کــەوابوو پێویــستبوو بگەرێمەوەو سەر لەنوێ دەستم پێکردبێتەوە لەدیوەکە چوومە دەورو دیــسان هاتمــەوە ژوور، بــیرم هاتــەوە بــەدیتنی پیاڵــەو گلێنەکــە ئارامببوومەوە.

سـەیرم کـردو ئەوئارامییـەم لەدەروونمـدا هەسـتپێکردەوە، پاشـان بـــەئارامی لەسەرکورســـییەکە دانیـــشتم و هـــەوای دیوەکـــەم بەهەناسـەیەکی قـوڵ هەڵمـژی، پاشـان چـاوم بـەقفڵێك کـەوت لـەلای دەرگاکـەوە هەڵواسـرابوو، دوایـی چـاوم بڕییـە دەرگـا دارینەکـەو هەسـتام ودەرگاکـەم لەمـشت کـرد، چـاڵوو قوڵییـەکانی دەرگاکـەم لەمشت کـرد کەدەسـتم لەئاسـنە خڕەکـان کوتـا پیـاوە دارتاشـەکەم بیرکەوتـەوە، ئـەمجارەیان پارچـە دارێکـی رەنـدە دەکـرد کاتێـك دی سـەیری دەکـەم، بەوێنـەی ئاشـنایەتی سـەری بۆجووڵانـدم، منـیش بەروویدا پێکەنیم، کارگەکەی پڕبوو لەودەرگایانەی کەئێمـە لەماڵـەوە دانەیـەکمان هـەبوو. پـێڵاوم لەپێدانـەبوو، لەترسـی ئـەوەی بزمـارو تەلاشەدارم بەپێدا نەچن، هەنگاوێك گەرامەوە بۆدواوەو خـۆم لـەنزیك مێـزی کـلاو خوودەکـە دۆزییـەوە، ئـەمجارەیان بـە لەمـشتگردنی گورزێك، لەچەند هەنگاوی خۆمدا حیلەی ئەسپێکم گەیشتە بەرگوێ، کەهاتبووە سەر پاشوان و ئەگەرخۆم نەدابایە کەنار لـەژێر دەست و پێیـدا پـان دەبوومـەوە، بەترسـەوە خـۆم هاویـشتە گۆشـەیەکەوەو لەئێشی سەرم بەهۆش خۆم هاتمەوە.

زانیم سەرم بەرلێواری مێزەکە کەوتووە، هەستم بەتینوێتی دەکرد، گلێنەم هەڵگرت وسەیری نیوەکەم کرد، خاڵیبوو. دوێنـیّ لـەم گلێنـەم

خواردبووەو توونیەتیم شکابوو، داخوا ئەمرۆش وادەبێت؟ گلێنە خاڵییەکەم بۆلای زارم بردوو چاوم لەسەر یەك ناو هەستی نۆشکردنی شەربەتێکی خۆش تینوێتی شکاندمو خەوێکی شیرین بەسەرمدا زاڵبوو. هەرلەویٚ لەسەرمێزەکە خەوبردمیەوە، خۆم لە دەشتێکی بەریندا دۆزییەوە کەسەوزەگیا تانزیك ئەژنۆم هاتبوو، سەیری دەوروبەرم کرد، ئەسپەسپیەکەم بەدی کرد کەبەدرەختێکەوە بەسترابۆوە، چوومە لایو دەستم بەسەرو یالێدا هێنا، ئەسپەکە بۆنی لەپی دەستی کردم و هێشتی سواری بم، لغاوی ئەسپەکەم بەردابوو بۆئەوەی هەرکوێیەك پێی خۆشە بمبات. بەلای مەزرایەکدا تێپەرین تاقمێك ژن ومناڵ لەرووبارێکدا مەلەیان دەکرد، ئەوان بەدیتنی من مناڵەکانیان جێهێشت وەك یەکتربناسین دەستیان بۆبەرزکردمەوە، منیش وامکردو بەئارامی پشتەقاچێکم لەکەلەکەی ئەسپەکە کوتا بۆئەوەی هەنگاوی تونتر بکات،

فرمانەکەی جێبەجیٚ کردم، لە ژنەکان دوورکەوتینەوەو بەلای دیواری باخیدا تێپەڕ بووین، کە لقوپۆپی دارەکان هاتبوونەدەرو سێبەریان کردبوو. کاتیٚ تێپەڕ بووین سەرم خوار کردەوە بۆ ئەوەی سەرم وەلقو پۆپی دارەکان نەکەوێت، ئەسپەکە کووچەی باخەکەی تەی کردو بە لای راستیدا کە زەوییەکی بەیار بوو درێژەی بەڕۆیشتنەکەیدا، لە پاشان گەیشتینە زەوییەکی کێڵدراو لە دورەوە پیاوێك خەریکی کارکردنبوو، کاتێکی گەیشتینەلای ئیشەکەی بەرداو من لە گەڵ پیاوێکدا رووبەڕووبوم کە هەواڵێکی بۆ هێنا بووم، بێڵەکەی لەولا داناو یارمەتیدام بۆ ئەوەی لە ئەسپەکە دابەزم، بە

بزەیەکی شیرینەوە وتی: دەمزانی دێی و ئەم گەشتە پڕ مەترسییە ئەنجام دەدەی، وەرە لە پەنا جۆگە ئاوەکەدا ماندویت بحەسێنەوە، هەردوکمان لە پەنا جۆگەکە لە ژێر سێبەری دارێك دانیشتین، پرسی:

گەشتەکەت چۆنبوو؟ وتم:

زۆر باشبوو، هەستم بەماندوبوون نەکرد، بزەیەکی کردوو وتی:

خۆشحاڵم بەسەلامەتی هاتی، ئە سپەکەت باشەو ئەم ڕێگایە شارەزایە، هەر بۆیە هەستت بە ماندوویی نە کردووە، لە وانەبوو بەلایەکدا بڕۆی و ڕێگاکە گوم بکەی، بە جوڵەی سەر قسەکەم پشتڕاست کردەوە سەیرێکی دەوروبەرم کردو پرسیم:

تۆ لێرە چی دەکەی؟ سەیرێکی زەوییە کێڵدراوەکەی کردوو وتی:

زەوییەکە بۆ بەروبووم ئامادە دەکەم، وتم:

ئامادەکردنی ئەم هەموو زەوییە بە تەنیا دژوارە ! بزەیەکی کردو ووتی:

نا بۆ یەکێك دەزانیٚ چ بە رهەمێك هەڵدەگریٚ! هەورێکی سپی لە ئاسماندا جووڵاو لەو جێیەی لێی دانیشتبووین هاتە خوارەوە، دڵۆپە ئاوم لەسەر دەموو چاوم هەست پێکردو لەگەڵ شنە بایەکی نەرمدا فێنك دەبوومەوە، بیٚ ئەوەی هەست پیٚ بکەم چاوم هەڵهێنان و ئاغای سەبووریم روو بە رووی خۆمدی، پەرداخێك ئاوی بەدەستەوە بوو.

نەمدەزانی لە خەوام یان بێدارم، سەیری دەوروبەرم کرد، لە نێو ژوورەکەدابووم، بەلاّم نەك ئەو ژورەی لە سەر کورسییەوە چوو بوومە گەشت و گووزار، بەڵکو لە دیوێك کەلەسەر تەختەکە ڕاکشابووم،

ئاغای سەبووری بە شێوەیەکی سەیر تێم ڕامابوو، هەوڵمدا هەستم، بەلاّم لەشم زۆر سەیر گرانبوو، وەك موسافیرێکی، ماندووبووم کە لە سەفەرێکی دوورو درێـژ گەڕابێتـەوە، نەمـدەزانی دەزانێـت چـوومە سەفەر یان نا، ئەگەر بپرسێت لە ژووری نوستنی ئەو چ دەکەم چ وەلاّمێکـی بدەمـەوە، هەوڵمـدا هەسـتم بـەلاّم ئاغـای سـەبووری نەیهێشتو وتی:

هێندێ پشوو بدە تا باشتر دەبی، وتم

تینوومە، پەرداخە ئاوەکەی لە لێوم نزیك کردەوەو وتی:

لە قومێك زیاتری لێنە خۆیەوە، وتم :

سە عات چەندە؟ سەیری سەعاتە دیوارییەکەی کرد ووتی:

چەند دەقیقەی ماوە بۆ حەوت، بە پەلە هەستامو وتم: "ئەی ڕۆ، نانی شەو درەنگبووە، بەپەلە لەتەختەکە هاتمە خوار. سەرم گێژ بوو، خەریکبوو بکەوم کە سەبووری شانیگرتم و وتی:

پەلەمەکـە هێنـدێکی تـر پـشوو بـدەو قـسەش مەکـە، بـا بێیـەوە سـەرخۆ. بـە یارمـەتی ئـەو جـارێکی دیکـە درێـژ بوومـەوەو چـاوم لەسەریەك دانان، وا بزانم خەو بردمیەوە، لەبەرئەوەی کاتێك چاوم کـردەوە تیـشکی گڵۆپەکـە چـاوی ئـازار دام، ئـیتر مانـدوو نـەبوومو هەسـتامو لـە ژوورەکـە دەرکـەوتم، ئاغـای سـەبووری لـە حەوشـەدا باخچەکەی ئاودەدا، کەبینیمی وتی:

وا باشترە هەرکەسێ دەچێتە گەشتو گوزار بەئامادەییەوە بچێتو ئەگـەر دەچێتە گەشـتێك تـا ئێـستا نەچووە پێویـستە شـارەزایەك لـە گەڵ خۆیدا بەرێ،

قسەکانی لە جێگەی خۆم رایگرتمو نەمدەتوانی قسە بکەم، سۆندەی ئاوەکەی بە دەستەوەبوو درێژەی پێدا: ئەمشەو میوانی ئێوەم، کە وایە پەلەبکە بێ خواردن نەبن، لەماڵەوە دەرکەوتم و وتم:

خوا بکا دایکم نە گەڕابێتەوە، چونکە نازانم چ وەڵامێکی بدەمەوە.

ئاغای سەبووری پێکەنی و ووتی:

گاڵتەم کرد، بەڵام وا باشتر نەبوو لە پێشدا ئیشەکانت کرد، پاشان چوبایە سەفەر، وتم:

دڵنیانەبووم سەرکەوتوودەبم، لەبەرئەوەی دوێنێ تەنیا چوار کاتژمێری برد، بەڵام ئەمڕۆ. قسەکەی پێبڕیمو بە سەرسوڕمانەوە وتی: واتا دوێنێش چوویە گەشتو گوزار؟ سەرم دانواندو وتەکەییم پشتڕاست کردەوە، بە داخەوە سەرێکی جووڵاندو وتی: کارێکی هەڵەمان کرد، هەردووکمان کاتێك زانیم هەلومەرجی سەفەرت تێدایە نەدەبوو کلیلی ماڵەکەم دابایەی، هیچ دوور نەبوو بەڵایەکت بەسەر خۆت هێنابا، ئەمڕۆ لە کەنار باخچەکە بینیمی بە دانیشتنەوە خەوت لێکەوتبوو، کاتێك لەم رەوشەدا دیمی زانیم چوویە گەشتو گوزار،

بۆ هێنانی ئاو چومە هۆڵەکە لە ئاڵۆزی ماڵەکە زانیم گەشتێکی دوورو درێژت ئەنجامداوە، لقی هێندێ لە گوڵدانەکان شکابوو، هەیکەلی ئەسپە باڵدارەکە کەوتبوەخوار، ئەم جارەیان بەخێر گوزەرا، بەڵام لەوانەبوو ئەم گەشتە ئاکامێکی خراپی لێبکەوێتەوە، بە لێن بدە ئیتر بە تەنیا بۆ سەفەر نەچی. وتم:

نەمدەزانی لە خەومدا بەڕێدا دەڕۆم چونکە دوێنێ وا نەبووم. بزەیەکی کردو وتی: دوێنێ تەنیا هەندێك پیاسەت کرد، بەڵام ئەمڕۆ

گـەڕان و توێژنەوەشـت لـێ زیـاد کـرد، هـەر بۆیـە لەهـەموو جێیـەکی ماڵەکـەدا شـوێنەوارت لـە پـا ش خـۆت جـێ هێـشتوە، ئـەم ئاگـادار کردنـەوەم لێـوەربگرە، دووپـات بونـەوەی ئـەم چـە شـنە سـەفەرانە کاریگـەری لەسـەرت دەبێـت، کەوایـە ئیتر بـێ موبـالاتی مەکـە، وتم: مەمنونتم ئاگادارت کردم، بەڵێنی دەدەم ئیتر دوپاتی نەکەمەوەو بۆ ئـەوەی خاتـاتر جـەم بێـت کلیلـی ماڵەکـەییم دایـەوە، بـە شـکەوە کلیلەکـەی وەرگـرت و چـاوی بڕییـە پەنجەرەکـە بەپەلـە خـۆراکێکم ئامادەکردو کاتێك لە ئیشەکە تەواو بووم، ڕووبەڕوی دانیشتم و وتی: کاتێك بیری لێدەکەمەوە چۆن بە تەنیا چوویە سەفەر هەموو جەستەم دەلـەرزێت، دانیـشەو لەهەوەڵـەوە بـۆم بگێـڕەوە چـۆن بـەرەو سـەفەر ڕێکەوتی، باسی سـەفەری یـە کـەم و دووەمـی خـۆمم بـۆ کـردو پاشـان لێم زیاد کرد، شتێك بەرەو ئەم سەفەرەم دەبات بوونی ئەو پیاوەیە، هێزێکی تێدایە بولای خۆی دەمکێشێ، بزەیەکی کردو وتی: براکەم کـاتێ زینـدوبوو ئـەم هێـزەی تێـدابوو، هـەموو کەسـی بـۆ لای خـۆی ڕادەکێشا، لەگەڵ ئەوەدا گەنجێکی کزبوو، بەڵام چاووی دەدرەوشـان کـە نیـشانەی عەشـق و هیـوای ژیـانی ئەبـەدی بـوو، ڕۆژێـك کـە ئـەم کەلوپەلانەم هێنایە ماڵ، هێندە بە هوگرییەوە سەیری کردم پێموابوو ڕووح لـە بـەدەنی جیـا بۆتـەوە، ماوەیـەك بـێ هەسـت ڕامـا، کاتێـك بـۆ دڵنیا بوون لەزینـدووبوونی دەسـتم لەسـەر شـانی دانـا، هـیچ هەسـتی نەکرد، ناچار بووم چە ند جارێك بانگی بکەم و بە زللـە لـە رووومـەتی بـدەم، دەتگـووت لـە خـەوێکی قـوڵ خەبـەری بۆتـەوە، بـە ترسـەوە سەیری دەوروبەری دەکرد، پرسی:

من لە کوێم؟ لێم پرسی:

چ شتێکی ئەم کەلوپەلانە دڵی گرتووی کە هێندە ماتبووی، چاوی لە دەمووچاوم کردوو وتی:

من بەدیتنی ئەو دەرگاو قفڵە خۆم لەرابووردوودا دییەوە، چەند جێگەیەکی سەرسەوزو ئاغرامبوو: قسەی ئەو رۆژەی براکەم بەجدی وەرنەگرت، وامزانی خەیاڵی بووە، بەلاّم بەیانی ئەو رۆژە کەگەرامەوە بۆماڵ دایکم شتی سەیرو سەمەرەی بۆباسکردمو وتی، براکەم ئارمین بەرۆژی رووناك لەکاتێکدا چاوی بەستبوون، بەسەر لێواری دیوارەکەدا دەرۆیشتو پاشان لەدەرگای حەوشەوە هاتە خوارێ، بێئەوەی قسەیەك بکات قاچی لەحەوزەکە خستو بەجلی تەرەوە درێژی وپانی حەوشەکەی تەی کردو بەوجلانەوە چووە نێوجێگەکەی،

کاتێك چوومە ژووری ئارمین تازە چاوی کردبوونەوەو پەرداخێکی شکاوی بەدەستەوەبوو، کەقسەم لەگەڵدا کرد زانیم جارێکی دیکە چۆتە سەفەرو ئەگەر پەرداخەکە نەشکابا ئەو تائێستاش لەسەفەردابوو،

تکام لەئارمین کرد هەقی بەسەر ئەشیاکانەوە نەبێتو بۆدڵنیایی زیاتر قفڵ و دەرگاکەم بردبونە ئەمبارەکەوەودەرگام داخست. دوو رۆژ دواتر کاتێکی ماندووبوومو لەسەرکارەکەم گەرامەوە بۆماڵ بینیم شادو لەسەرخۆ لەحەوشەیدا پیاسەی دەکرد. دەستم لەسەر شانی داناو سلاّوم لێکرد، بەلاّم ئەودەنگی نەبیستم ئەمجارەیان بەپێچەوانەی رابردوو چاوکراوەبوون و بەچاوی ئاوەلاّوە چووبوو

بۆسەفەر چەندجار بانگم کردوشانم تەکاندان تەنانەت زللەیەکیشم لێدا، بەڵام هەڵنەستا ناچاربووم ئاوم بەدەموو چاوایدا کردو پاشان شتێکم لەبەرپێی کێشا بەزەویدا. کاتێك هاتەوە سەرخۆی تووڕەو ترسابوو لەگەڵ ئەوەشدا بەلەشی چووك و زەعیف بوو، بەئاسانی پاڵی پێوەنام و وتی:

چیت بەسەرمنەوەیە بۆناهێڵی چێژ لەژیانم وەربگرم. دەموو چاوی لەبەر لاوازی سپی هەڵگەڕابوو، ئیتر هێزی پێشووی تیادا نەمابوو. لە ئامێزم کردوو بردمەوە سەر جێگەکەی زۆربەئاسودەیی پێڵوی لەسەریەکدانان وخەوت، بەپەلە رامکردە لای ئەمبارەکەو سەیرم کرد درگاکەی کراوەتەوە، کاتێکی پرسیارم لەدایکم کرد ووتی ئاگای لێ نیە چونکە چو بوو بۆبازاڕو ئارمین لەم کاتەدا توانیبووی دەرگای ئەمبارەکە بکاتەوە، بڕیامدا ئەشیاکان لەماڵ بەرمدەرێ و بەئامانەت لەلای برادەرێکیان دانێم. بەڵام ئارمین لەبەرم پاڕایەوە ئەم کارەی نەکەمو بەڵێنی پێدام نەچێتە ئەم سەفەرە پڕمەترسییەوە، منیش بەڵێنمدا شتەکان لەماڵەوە دەمێنن، ماوەیەك لەم ڕوداوە بەسەرچووبوو کەچووم بۆ "تەبەس"[2] کاتێکی گەرامەوە سەیرم کرد ئارمین تێك چووە، دایکم بۆی باسکردم، ڕۆژی دووای ڕۆیشتنم، ئارمین چۆتە ئەمبارەکەوەو ئەمکارەی چەند ڕۆژدوپاتکردۆتەوە دایکم ووتی رۆژی یەکەم کاتێك ئارمین لەئەمبارەکە هاتەدەر، چەند کاتژمێر بێ جووڵە لەسەر لقی درەختەکە دانیشتبو. دایکم بۆپاراستنی ئابرووی لێی دەپارێتەوە دەست لەم ئیشە منالأنەیە

---

[2] شارێکە لەناوەندی پارێزگا ی خۆراسان

هەڵگرێت و لەسەردارەکە بێتەخوارەوە بەڵام ئەو گوێی پێنەدابوو بەپارانەوەی دایکم و هەرلەسەر دارەکە دەمێنێتەوە. شەوێ دایکم خواردنی بۆدەبات ولێی دەپارێتەوە بیخوات و لەدارەکە بێتەخوارەوە، بەڵام گوێی ناداتێ و کەدایکم توورە دەبێت قاپی چێشتەکە بەعەرزیدا دەدات، ئارمین لەدەنگی شکانی قاپەکە بەئاگا دێتەوەو لەسەردارەکە دەکەوێتە خوارو لەخۆیدە چێت، دایکم هەمووشەوێ وەخەبەردەبێ و چاوی دەبڕێتە ئارمین. بەیانی ئارمین وەقسە دێت بەدایکم دەڵێت تۆو ئاسەف کۆسپی سەر رێگەی خۆشبەختی منن. ئێوە ناهێڵن چیتر خۆشبەختی وەربگرم، لەم دونیایەدا رووی خۆشبەختی بەخۆمەوە نابینم، کەوابوو لێم گەرێن بچمە ئەو جێیەی پەیوەستم پێیەوە. دایکم هیچ لە قسەکانی ئارمین تێناگات و ئارمین رۆژی دوایی دەچێت بۆ سەفەر. سەفەری پێشوو

کەزۆر زەعیفی کردبوو. دایکم دەیگوت مەیلی زۆری بەوە پەیداکردبوو شەوو رۆژ لەخەوی بێهۆشیدا بێت، کاتێک ئەوم بینی بەباشی نەیدەناسیمەوە و باسی جێگەیەکی دەکرد دروستکراوی دەستی مرۆڤ نەبوو. کەس لەقسەکانی ئارمین تێنە دەگەیشت جگە لەمن کەدەمزانی لەژێرکارتێکردنی ئەشیاکان وای لێهاتووەو ئەوان ئەوهەلەی بۆ دەرەخسێنن، تاکوو لەدونیای خەون و خەیاڵدا بچێتە گەشتوو گوزار، جارێک بۆ گێرانەوەی بۆدونیای راستە قینەی ناچاربووم سەفەربکەم، بەڵام گەشتی من بەپێچەوانەی هی تۆو ئارمین بوو، من لەگەڵ بوونەوەری سامناکدا بەرەو روو بووم و

ناچاربووم سەفەرکە درێژە پێنەدەم، ئەوەی لەسەفەرەکەمدا بینیبوم ئارمین پێم پێدەکەنی و وتی:

کاتی سەفەر کردن دڵ لێوڕێژکە لەعەشق و ئەڤین و بیر لەپاکی وچاکە بکەوە.

سەیر دەکەی سەفەرێکی خۆشت لەپێشدا دەبێت، دۆزەخ هی مرۆڤی ناپکە گەر دەتەوێ دەستت بگات بە بەهەشت، دەروونت لەپیسیەکان

پاک بکەوە.

براکەم چوو بۆ سەفەرێکی بێگەرانەوەو شتێکی لەپاش خۆی جێهێشت کە ئامرازی پێوەندی من وئەوە. من بەم چەشنە دەتبینم کەتۆش دیوتە. پرسیم:

ئەو چۆن مرد؟ بزەیەکی تاڵی کردو وتی:

زستان بوو رەوشی بەرەو خەراپبوون چوو، زیاتر لەپێشوو لاوازببوو. چەند رۆژبوو دەرمانەکانی نەدەخواردن و من ودایکم نەمانتوانی رازی بکەین دەرمانەکانی بخوات، ئەو بەمن ودایکم پێدەکەنی و دەیگوت: ئەگەر ئێوە بزانن لەچ دۆزەخێکدا دەژین داواتان لێ نەدەکردم بۆمانەوەلەم دۆزەخەدا هەوڵ بدەم، دەمەوێ برۆم وخۆم لەم دۆزەخە رزگاربکەم، هەرئەمشەو بەدوور لەچاوی من ودایکم گەشتەکەی دەستپێکردو ئیتر خەبەری نەبۆوە، بەیانی مەیتەکەمان لەکاتێکدا لەسەربان دۆزییەوە کەهەیکەلی ئەسپی باڵداری لەئامێزدابوو زانیمان لەسەرمان رەق هەڵاتووە. ناشتمان و خۆشمان لەوێ بارمانکردو هاتینە ئەمماڵەوە، بۆدایکم زۆر

دڕواربوو، جێگەی دیاری کورەکەی لەو خانووەدا تەحەمول بکات، ئێستا من ماومەوەو ماڵێکی چۆڵ و هۆڵوبیٚ دایك، وتم:

ئەگەر نەچووبامە ئەم گەشتە قسەکانتم بروا نەدەکر، بەلاٌم ئێستا بروادەکەم، ئاغای سەبوری هەستاو لەپەنجەرەوە سەیری کووچەی کردو وتی:

من ئێستا نامەوێت ئەم گەشتە ئازیزێکی دیکەم لیٚ بستێنیٚ. دەبیٚ سۆیندم بۆ بخوی هەرگیز نەکەوییە بیری سەفەرەوە. دایکت تەنیا تۆو منی هەیەو منیش تەنیا بەدڵخۆشی ئێوە لەم کووچەدا ماومەوە. پێکەنیمو وتم: خاترجەم بە چونکە من بەپێچەوانەی براکەت ژیانم بەگەشت خەراپی یەکانیەوە خۆشدەوێت. بەهاتنەوەی دایکم قسەکانمان لیٚ بڕییەوەو دایکم بەبینینی ئاغای سەبووری بەخۆشحاڵییەوە وتی:

نەمدەزانی ئەمشەو دەهاتییەوە دەنا دەچوومە زیارەتی قەبرستانەکە. ئاغای سەبووری وتی:

چەند سەعاتێکە هاتوومەوە. بەرنامەی ئیشەکەم ئەوە بوو ڕۆژی پێنج شەمە بەرەو تاران ڕێکەوم، بەلاٌم لەناکاو تووشی دڵە ڕاوکیٚ بووم جەماعەتم جێهێشتو گەرامەوە، بەوتنی ئەم قسەیە چاوی لەچاوانم بڕیو هۆی نێگەرانییەکەیم زانی، بەلاٌم دایکم بەپێکەنینەوە وتی:

دڵەڕاوکێی سامانی دونیات بوو، وات نەدەزانی من وساڵوومە بتوانین ئاگاداری شتە دێرینەکانت بکەین. ئاغای سەبووری وتی:

باوەڕبکەن وانیە. دایکم وتی:

هەرچی بێت خۆشحاڵین بەساغی گەراوییەوە، ئەگەر راستان بوێت دونێ شەو نەخەوتمو کەچریەیەك دەهات خەبەرم دەبۆوەو سەیری ماڵی ئێوەم دەکرد، خۆزگە ئەم شتە دێرینانەت بەلای برادەرێکەوە دادەنان بۆئەوەی هەم فیکری خۆتان ئاسوودە بێت هەم هی ئێمە، ئاغای سەبووری وتی:

پێش ئەوەی کۆنی شتەکانم لامەبەست بێت چونیەتیەکەیانم لاگرینگە، دایکم ئیتر سەبارت بەئەشیاکان قسەی نەکردو قسەکانمان سەبارت بەشتی دیکە درێژەی پێدا، کاتێك سەبووری ماڵی ئێمەی جێهێشت دایکم وتی:

بەپێچەوانەی رواڵەتەکەی پیاوێکی خۆێنگەرمو میهرەبانە. بەلاّم نازانم بۆ تائێستا ژنی نەهێناوە، وتم:

دێرین ناسەکان لەرابردوودا دادەژین و هۆگرییان بەخەڵکی ئەم زەمانەوە نیە. دایکم گۆشەچاوێکی داگرت و وتی: ((ئەمەچ قسێکە ))و چۆدەرەوە.

بەیانی کاتی سواربوونی ئەمانەکە دیم، ئەمجارەیان زانی، بەسەری سلاّوی لێکردمو منیش بەم چەشنە وەلاّمم دایەوە. کاتێکی سواربووم بەلایدا تێپەربووم، بزەیەکی لەسەر لێوان پشکوتبوو. بەختیاربووم لەوەی خەریکە لەتەنیایی بێتە دەرو بۆ دونیا پێدەکەنێت،

کاتێك لەئیدارە دابووم مەجالی بیرکردنەوەی ماڵەوەم نەبوو، بەلاّم کە دەگەیشتمەوە ماڵ بیرم لەدەوروبەری سەبووری و ژیانەکەیدا بوو. دەمویست بزانم داخوا دایکم دیویەتی پێی باشە یان نا. ئەگەر

وەلامی دایکم بەڵێ بایە، خاترجەم دەبووم و ئەگەر دایکم دەیگوت نەم دیوە، پەرێشان و نیگەران دەبووم. دەترسام چووبێتە گەشت وگوزارو لەخەویدا کەوتبێتە مەترسییەوە،

قسەکانی ئەوشەوەی سەبووری زۆری ترساندبووم و ئەوکاتە بوو کەمەترسی ئەوکارەی بۆباسکردبووم، بۆم دەرکەوتبوو. چەند هەفتەیەك بەوەرگرتنی زانیاری لەدایکم تێپەرکردو بۆم روون بۆوە قسەکانم دایکمی خستۆتە شکەوەو بەپرسیاری وەك: دەتەوێ ئاغای سەبووری بۆشەوێ بانگ بکەم، ناخافڵی دەکردم، نەمدەتوانی راستییەکان بەدایکم بڵێمو لەلایەکیش نەمدەتوانی بێ لایەن بەلایدا تێپەربم، کە وەرزی پایز دەستپێیکردو بارانە پایزە دەستی بەبارین کرد، دراوسێکان زۆربەیان لەماڵەوە دەمانەوەو زۆرکەم لەیەکتریان دەپرسی ،. دایکیشم وابوو، ئەو خەریکی چنینی چاکەتبوو پرسیم:

ئەمرۆ ئاغای سەبووریت بینی؟ بەبێزارییەوە شانی دەلەقاندو دەیوت:

نا! سەرمابوو لەماڵەوە نەچوومەدەر، من بۆئەوەی هەواڵێکی لی وەدەست بخەم هەستی دایکم دەجووڵاند بۆئەوەی ناچاری بکەم سبەینێ بچێتە دیدەنی ئاغای سەبووری، رۆژێکی پایز کاتێکی بەمەبەستی چون بۆ ئیدارە لەماڵ دەردەکەوتم گۆشەنیگایەکم هاویشتە لای ماڵی ئاغای سەبووری،

دەرگاکە کراوەبوو، توشی سەرسورمانیکردمو وای لێکردم زەنگەکە لێبدەم، چەندجار بەدوایی یەکدا ئەمکارەم کرد، بەلام

وەڵامێکم نەبیست، دایکم ئاگاداركردو ئەویش ئەمكارەی چەند جارێك ئەنجام داو كە وەڵامی نەبیستەوە وتی:

زوو بچۆ ئاغای نەویدو ئاغای سالاری ئاگادار بكە، ئاغای نەوید لەماڵەوە نەبوو، ئاغای سالاریو خانمەكەی بەپەلە هاتنو لەماوەی چەندچركەیەكدا هەموو هاوسێكان ئاگاداربوونو كووچەكە پڕبوو لەئاپۆرای خەڵك، دایكم وخانمی نەیری و ئاغای سالاری تینیان دایەخۆیان و لەگەڵ مندا هاتنە ماڵەكەوە. ماڵەكە رێكو پێكبوو شتەكانی ماڵی لەسەر جێگەی خۆیانبوو. ئەسپە باڵدارەكە لەسەرزەوی كەوتبوو، خانمی نەیری هەڵیگرتەوەو لەجێگەكەی داینایەوە، چاوێكی بەدەوروبەردا خشاندو بەدایكمی وت:

لەقاتی سەرەوەش هەموو شتێك رێكوپێكە و من هەموو ژوورەكانم بینی، دایكم وتی:

كەوایە قسەی خانمی نەیری راستەو ئاغای سەبووری فەرامۆشیكردووە دەرگاكە دابخات، كەوتمە دڵەراوكێوەو نەمدەتوانی بڕوابكەم ئاغای سەبووری دەرگای دانەخستووە، خۆمگەیاندە ژوورەكەو سەیری قفڵە دێرینەكەمكرد. بەدیتنی كلیلی ماڵەكە لەنێو قفڵەكەدا دڵم راچەنیو زانیم سەبووری چۆتە گەشتو گوزارو لەكاتێكدا لەماڵەكەیدا راوەستاوین، ئەو لەهەرێمی خەیاڵاتدا دەگەڕێت بەخۆم وت:

ئایە ئەمبارەكەش گەڕاون؟ سەیری یەكتریان كردوئاغای سالاری وتی:

وانا، لەوانەیە دزەكە لەوێ بێ؟ وتم:

باوەرناکەم دز هاتبێت، بەڵام خراپ نیە سەیرێکی ئەویش بکەین، ئاغای سالاری وەپێشکەوت و منو دایکمو خانمی نەیری بە دوای کەوتین، دەرگای ئەمبارەکە لەدەرەوە داخرابوو وهەموو بەم دڵنیاییە کە دزی لێنیە گەراینەوە حەوشەکە.

دایکم رووی تێکردمو وتی:

بچۆ بەئیشەکان رابگە درەنگە، ئاغای سالاری پرسی:

رەقەم تەلەفۆنی نوسینگەی کاری سەبووریتان پێنیە؟ دایکم سەیرێکی منی کرد وتم:

نا، پێم نە، بەڵام دەبێت دەفتەرێکی بچووك بەلای تەلەفۆنەکەوە بێت، خانمی سالاری چووە هۆڵەکەو دەوروبەری تەلەفەنەکەی دیو لەوێوە بەدەنگی بەرز ووتی:

هیچ دەفتەری لیّ نیە، دایکم دیسانەوە رووی تێکردمو وتی:

تۆ برۆ، هەوڵدەدەین پەیوەندی بەئیدارەکەیەوە بکەین، ئەگەر سەرکەوتوبووین ئەوە باشتر، دەنا دەرگای ماڵکە دادەخەین هەتا سەبووری دەگەرێتەوە، من خواحافیزیم لێکردن و رۆیشتم، کرانەوەی دەرگای ماڵکە، خستمیە نێو ئەو بیرکردنەوەی کەئەو لەخەودا رۆیشتووە وچۆتە دەرو ئێستا درێژە بەگەشتەکەی دەدا، لەوانەیە ئەگەر هەندێك بگەرێین بتوانین بیدۆزینەوە، لەچوون بۆئیدارە پەشیمان بوومەوەو دەستم کرد بەگەران، بەخۆم وت: ((ناتوانێت بەچاوی بەستراوەوە زۆر زۆر دوور کەوێتەوە)) بەڵام لەپڕ ئەم بیرەم بەمێشکدا هات، ئەگەر شەوی پێشتر سەفەرەکەی

دەستپێکردبێت و هەر ئەوشەوە لەماڵ چووبێتە دەرەوە چی؟

بەم بیر کردنەوەم لەرزیم و هەنگاوم تونترکردن، لەپێشدا لەجادەو کووچـــەکانی دەورووبـــەرم روانـــی، قاچـــم لەگـــەرانی بیـــسود مانـدووبووبوون و هامووشـۆی ماشـێن وخـەڵك گەرانەکـەی نـاخۆش کردبووم، ئەم هیواداریيەم دەدابەخۆم کەهۆرینی ماشێنەکان دەبێتە هـۆی ئـەوەی لەخـەو هەڵسێت، لـەرێبوارێك پرسـیاری کاتـژمێرم کـرد دەرکەوت دووکاتژمێر لەدەوامی فەرمانگە تێپەریوە، بێهیـواو مانـدوو گەرامەوە بۆماڵ و لەبەر سەرسورمانی دایکم، هـۆی نەچوون بـۆدایرە و درەنـگ گەیـشتنە پـاس و دەسـتنەکەوتنی، ماشـێنم کـردە بیـانوو، دایکم پیاڵەیەك چای لەپێش دانام و لەبەرماندوویی قاچم راکێشان و لەدایکم پرسی:

توانیتان پەیوەندی بەدایرەکەی سەبوورییەوە بگرن؟ دایکم ووتی:

ئاغـای سـالاری ئـەمکارەی کـرد بـەڵام گوتیـان تائێـستا سەبووری نەگەیوەتـە ئیـدارە، ئاغـای سـالاری بەناچـاری پـەیامێکی بۆدانـاو رووداوەکـــەی پـــێ وتـــن، ئەگـــەر ســـەبوری بـــچێتە ئیـــدارە، بێـــشك هاوکارەکانی پێی دەڵێن و ئەو بۆسەردان دەگەرێتەوە.

دایکم بەدڵنیایی یەوە دەدوا، بەڵام من ئەو دڵنیاییەی ئـەوم نـەبوو، درەنگ کەوتنی سەبووری بۆئیدارە شکو گومانەکـەی زیـاترکرد بـوو. من کلیلەکەم لەقفڵە کۆنەکەدابوو، دەمزانی ئەو کلیلی ماڵکەی پێنیـە، لەوەی کەکلیلەکەم هەڵنەگرتبوو بەداخبووم، لەدایکم پرسی:

دەرگـــای ماڵەکـــەتان داخـــست؟ دایکـــم بەنیـــشانەی بـــەڵی ســـەری دانوانـدو مـن شانـسی چـوونە ژوورەوەم لـەکیس چـوو، بۆگـۆرینی جلەکانم چوومەژوورەکەوم و بیرمکردەوە، چۆندەتوانم بچمە ماڵـەوە و

هــەموو جێیــەك ســەنك وســووژن بــدەم، بــەلاّم ئاگاداركردنــەوەی سەبووریم بیرهاتەوەو لەسەفەرەكە پەشیمان بوومەوە، لەتەواو بوونی دەوامـی ئیـدارەش تێپـەریكردبوو هـەواڵی سـەبووری دەسـتنەكەوت، ئێواریٚ ئاغای سالاری هاتە ماڵی ئێمەو لەدایكمی پرسـی: سـەبووری وەدیهاتەوە؟ دایكم وتی:

نا. ئاغای سالاری وتی:

لەماڵەوەش نیە، ئایا مومیكنە جوو بێتە ئیدارە؟ دایكم وتی:

دەبیٚ وابیٚ، ئەگینا دەهاتەوە بۆئەوەی بزانێت چی روویداوە؟.

ئاغای سالاری نیگەران بوو، چووە نێو فیكرانەوە. دایكم بۆئـەوەی لەنیگەرانی . دەربازی بكا وتی:

لەوانەیە چووبێتە پێسپێردراوی ئیدارەكەی و ئێمە ئاگامان لێنیە، ئاغـای سـالاری بەپەرچـی قـسەكەی دایكمـی دایـەوەو وتـی: ئەگـەر چووبا، هاوكارەكانی دەیـانزانی، مـن لـەوە دەترسـم نـەكا دزیبێتیـان، بەم قسە دایكم ئاغێكی هەڵكێشاو پرسی:

بۆ بیدزن؟ نەساماندارەو نەدوژمندار. ئاغای سالاری وتی:

ئێمە چووزانین، مرۆڤ نازانێـت كـیٚ دۆسـتەو كـیٚ دوژمـن. بەراسـتی نیگەرن بووم، واباشترنیە پۆلیس ئاگاداربكەینەوە؟ دایكم وتی:

تاشــەو درەنگانێــك رادەوەســتین، ئەگــەر ســەرو ســۆراغی وەدی نەهاتـەوە ئـەمكارە دەكـەین، ئاغـای سـالاری پەسـەندی كـردو وتـی: ئەگەر هەواڵێكیتان چنگ كەوت ئێمەش ئاگاداربكەنەوە، خواحافیزی كــردو رۆیــشت، هــەمووومان لەنارەحــەتیان چـاومان لــەریٚی ئاغــای

سەبووری بوو، شەویش داهات و سەبووری نەهاتەوە، نمە بارانێك دەستی بەباین کردبوو.

نالەباری کەش وهەواکارەکەی دژوار کرد بوو. ئەوشەوەی ئاغای سالاری شوێن رووداوەکە نەکەوت و دایکیشم لەچاوەروانیدا شەوی کردە رۆژ، بەخۆشییەوە رۆژی هەینی بوو زۆربەی دراوسێکان لەماڵبوون. نانمان دەخوارد، دەنگی دەرگا لێدرا، ئاغای نەویر هاتەژوورو لەدایکمی پرسی:

هەواڵێکتان دەستکەوت؟ دایکم وتی: نا، ئاغای نەویر وتی: بەداخەوە ئەدرەسی هیچ کام لەخزمەکانیشی نازانین بۆئەوەی ئاگاداریان بکەین. وتم:

واباشترە جارێکی دی ماڵەکە بگەرێین، لەوانەیە هەر لەماڵدابێت و رووداوێکی بۆ هاتبێتە پێشەوە، دایکم سەری سوورما وتی:

مەبەستت چیە؟ وتم: ئێمەدوێنێ سەرانسەری ماڵەکە گەراین و حەمام و شوێنەکانی دیکە نەچووین .

من لەسەر ئەم بروایەم جارێکی دیکە ماڵکە بگەرێن، ئاغای نەوید وتی:

فکرێکی خراپ نیە، ئەگەر خۆشیمان نەدۆزییەوە لەوانەیە لەسوچ و کەنارێکدا دەفتەری تەلەفۆنەکان دەست بکەوێت، بۆئەوەی بتوانین خزمەکانی ئاگاداربکەینەوە، دایکم فکرەکەی پەسەند کرد و هەموومان بەرەو ماڵی سەبوری رێکەوتین، ئاغای نەوید بەسانایی لەدیوارەکە سەرکەوت و چووە ماڵەکەوەو دەرگاکەی کردەوە و هەموومان چوینە ژوور، یەکەم بیرێکی کەبە مێشکم داهات هەڵگرتنی

کلیلەکە لەسەر قفڵە دێرینەکە بوو، بەڵام چۆن دەمتوانی لای خۆم رایگرم، ئەگەر سەبووری هاتبایەو کلیلی ماڵەکەی نادۆزیبایەو ە، دەبوو چ وەڵامێکی بدەمەوە، وام بە باشزانی کلیلەکە بەدزیو بەدوور لەچاوی دایکم وئاغای نەوید لەقفڵەکە دەرهێنم و بەچەشنێکی هەڵکەوت نیشانیان بدەم، بەم هۆیەوە هەم کلیلەکەم پێبوو هەم سەرەپەتێکیشم دابوو بەوان، دایکم وئاغای نەوید هەردوکیان بەرەو حەمامەکە چوون و من هەلم دەستکەوتو کلیلەکەم دەرهێناو لەسەر مێزەکە لەپەنا ئەسپە باڵدارەکەم داناو وام نواند

لەدەفتەری ژمارە تەلەفۆنەکان دەگەرێم، لەدیوەکە دەفتەری لێنەبوو، کاتێکی دیم دایکم وئاغای نەوید بەبێ هیوایی یەوە دێنە لای ژوورەکە بەخۆشییەوە وتم:

وەرن! بەپەلە خۆیانگەیاندە دیوەکەو من ل ئاماژەم بەکلیلەکە کردو وتم:

ئەوە کلیلی ماڵەکە نیە؟ دایکم کلیلەکەی هەڵگرت و بەجوانی سەیری کردو بەسەرسورمانەوە وتی:

با !ئەمەکلیلی دەرگای ماڵەکەیە، ئەی بۆدوێنێ نەماندەزانی؟ ئاغای نەوید سەرێکی کلیلەکەی کردو وتی:

کەوایە سەبووری بەپێی خۆی لەماڵەکە دەرنەکەوتووەو بەتۆبزی بردویانە، دایکم چاوی پربوو لەئەسرین و وتی:

خوانەکا دزیبێتیان، تەنانەت بیر کردنەوەشی نیگەرانم دەکات، ئاغای نەوید کلیلەکەی لەگیرفانی ناو وتی:

واباشترە بەشوێن دەفتەری تەلەفۆنەکە دابگەرێین، من وتم:

لەم ژوورەدا دەفتەری لێنیە، تۆ دیوی نوستنەکەی بگەرێ، منو دایکم وەشوێن پیٚو گەشتەکەی کەوتین،

دەمەویێت بزانم ئاخۆ کاتی سەفەرەکەی بەژوورەکەشدا رۆیشتووە یان نا؟ دەرگای کەنتۆرەکە دانەخرابوو من، دەرگای کەنتۆرکەم کردەوە، ئەو سندوقەی کاتی تازیەکە پووڵم لێدەرهێنا بوو، لەجێگی خۆیبوو، بەشوێن ئەو چەرمەی رەسمەکەی لیٚ کێشرابو، دەگەرام، بەلاٚم نەلەژێر سندوقەکەدابوو نەلەهیچ شوێنێکی کەنتۆرەکەدا.

جارێکی دی کەنتۆرەکە گەرام، دایکم سەرنجیداو وتی:

دەفتەری تەلەفوون خۆدەرزی نیە وابەدیقەتەوە دەگەریێ، دەنگی ئاغای نەوید کە بانگی دەکردین بووە هۆی ئەوەی گەرانەکە بەنیوەچڵی بەجێبهێڵمو بچمە خوارەوە،

ئاغای نەوید ئامارژەی بە دەفتەرێکی بچوك کەلەدەستیدابوو کردو وتی:

ئەم دەفتەرە کەی وەرگرت و لەپیتەکانی یەکەمەوە سەیرکرد، لەریزی یەکەمدا دەستی لەسەر ناوێك دانا وتی:

ئەم ناوەی بیستووە، ئاغای نەوید بزەیەکی کردو وتی:

بەڵی ! وابزانم خوشکەزای ئاغای سبووری بێت. واباشترە پەیوندی بەم ژمارەیەوە بگرین. دایکم پرسی:

باشە چی پیٚ بڵێین؟ بڵێن ئاغای سەبووری وون بووە؟ یان دزیویانە؟ ئاغای نەوید هەندیٚ بیری کردەوەو وتی:

واباشترە پرسیاری لێبکەین ئاغای سەبووری لەماڵی ئەوانە یاخوود بەمزووانە ئەویان دیوە یان نا؟ دیسان دایکم ووتی:

باشە ئەگەر پرسیان ئێوەکێن، بڵێین چی؟ ئاغای نەوید پرسیاری دایکمی بێ وەڵام هێشتەوەو چووەلای تەلەفۆنەکەو دانیشت و ژمارەکەی گرت، پاش ماوەیەکی کەم بەبێ هیواییەوە گوشییەکەی داناو وتی:

لەرۆژی هەینی یەو لەوانیە چووبنە میوانی، واباشە لای ئێواریێ تەلەفۆن بکەین، تائەو کاتەش ئاغای سەبووری خۆی دەگەرێتەوە بۆماڵێ. ئاغای نەوید کەلەگەران و تەلەفن کردن بێ هیوا ببوو، پێشنیازی دایکمی پەسەندکرد و گشتمان لەژوورەکە چووینە دەرەوە،

ئاغای نەوید خەریکی لەپێکردنی پێلاوەکاننی بوو، کەدەرگای ماڵەکەیان کردەوە ئاغای سەبووری بەسەرو قژێکی ئاڵۆزاووەوە پێی نایە ماڵەکەوە، هەموومان بەدیتنی هەناسەیەکی قوڵمان هەڵکێشا، ئاغای نەوید چووەلای شانی گرت و پرسی: لەکوێ بووی پیاوی باش؟ بۆ وات لێبەسەر هاتووە؟ چ رووی داوە؟ ئاغای سەبوری لەسەر قەراغی باخچەکە رۆیشتو بەدەنگێکی کز وتی: نا، بەمەبەستی ئەنجامدانی ئیشێك چوو بوومە دەرەوەی شار، بۆ یە وا ئاڵۆزاوم. بمبورن، بەراستی ماندووم، دایکم وتی:

لەدوێنێوە بەشوێنتا دەگەرێین، خۆ نیوە گیانت کردین، بەسەرسورمانەوە سەیری دایکمی کردو وتی:

چی رووداویك روویداوە؟ دایکم پێکەنی ووتی:

رووداوی چیت عەرزبکەم ! دوێنێ کاتێك سالوومە دەچوو بۆدایرەکەی، سەرنجی دابوو دەرگای ماڵەکەت، ئاواڵەبو وبوو،

زەنگی دەرگاکە لێدەدات بۆئەوەی پێت بڵێت، کاتێك دەنگێکی لەماڵەکە نەبیستبوو هات بەمنی وت و منیش دراوسێکانم ئاگاداركرد،

منو ئاغای سالاری گشت ماڵەکە گەراین چونکە واماندەزانی دز هاتۆتە ماڵەکەوە، بەلاّم بەخۆشییەوە هیچ گومان نەبوو. لەگەڵ ئیدارەکەتدا پەیوەندیانگرت، یەکێك لەهاوکارەکانتان وتی تائێستا نەچوویتە شوێنی کارەکەت، ئەوەبوو چاوەروان بووین بگەرێیەوە بۆماڵ، بەلاّم شەو داهاتو دیسان هەواڵێکت لەخزمەکانت بکەین وپێی بڵێین، بەرەبەرە خەریکبوو بروا بکەین لەماڵەوە دزیویانی لەبەر ئەوەی تەنانەت کلیلی ماڵەکەت لەگەڵ خۆدا بردبوو، ئاغای سەبوری دەستێکی بەقژە ئاڵۆزەکانیدا هێناو وتی:

بەڵێ، هەقتانە، هێندە بەپەلەبووم فەرا مۆشمکرد کلیلەکە لەگەڵ خۆمدا بەرم وامزانی لەپەلەپەلییان دەرگاکەم دانەخستووە، بۆیە هەمووتانم خستۆتە دەردە سەرییەوە، داوای لێبووردنم هەیە، تکایە بمبوورن، ئاغای نەوید وتی:

داوای لێبووردن پێو یست ناکات هەرئەوە کەتۆمان بەساغو سەلا تی دیی وە کافیە،

بەلاّم بێ زەحمەت لێرە بەدوا زیاتر ئاگات لەخۆت بێت، ئاغای سەبووری سەری دانەواندو وتی:

بەڵێن بێ ئیتر هەڵەی وا دووپاتنە کەمەوە، هیوادارم بمبەخشن، ئاغای نەوید دەستی لەسەر شانی داناو وتی:

گـرنیگ نیـە، زۆرمانـدووی پێویـستە پـشوویەك بـدەی، ئێمـەش دەبێـت بـڕۆین و ئـەوانی دی ئاگاداربکـەین کە بەسەلامەتی گەرایـەوە ماڵ، ئاغای نەوید دەستی لـەگیرفانی نـا کلیلەکـەی دەرهێنـا و دایـەوە دەست ئاغای سەبووری و وتی: ((برۆ پشوبدە ))ولێی جیا بۆوە، من ودایکیشم ئامادەی رۆیشتن بووین کەئاغای سەبووری وتی:

بوومـە مایـەی دەردەسـەری بۆئێـوە، بـەڵام ئـەوەی بـزانن مەبەسـتم ئازاردانی ئێـوە نـەبوو، ئـەم سـەفەرە لـەپڕ و لەناکاوە هاتـە پێـشەوە. کاتی وتنی ئەم قسەیە، چاوی لێکردم و زانیم بێ نەخشەی پێـشووتر چۆتە ئەم گەشتە، هەربۆ یە پێکەنیم و وتم:

وادیـارە سـەفەرێکی پڕگێرمـە وکێـشە بـووە، بەنیـشانەی پەسـەند کردنـی قسەکەم سـەری دانەوانـدو بـوو بـەهۆی راکێـشانی سـەرنجی دایکم و پرسی:

بەئاغای نەویـدت نـەوت چویتە سەفەر، ئاغای سـەبوری بزەیـەکی کـردو وتـی: مەبەسـتم لەسـەفەر، چـوونە دەرەوەی شـاربوو، دایکـم ووتی:

ئاهـا ! ئێـستا تێگەیـشتم، باشـە ئەگـەر کارێکـت بەئێمـە نیـە بازەحمـەت کـەم بکـەین، ئەگـەر حـەزت کرد بۆنـانی نیـوەڕۆ یـان شـەو وەرە ماڵی ئێمە، ئاغای سەبووری سوپاسی کردو وتی:

مەمنونم، موزاحیم دەبم، چونکە پێموایە گێڕانەوەی سەفەرەکەم بۆ سالوومەخانم سەرنج راکێش بێت،

سـەبووری بۆنـانی نیـوەڕۆ نـەبوو بـەمیوانمان، بـەڵام ئێوارەهـات، حـەمامی کردبوو رێکوپێـك ببـوو مانـدوویی پێـوە دیارنـەبوو، دایکـم

بـــەنێو چـــاوانی ئـــاوەڵاوە چـــوو بەپیرییـــەوەو ئاغـــای ســـەبووری لەبەرئـەوەی دایکمـی نیگـەران کردبـوو جـارێکی تـر داوای لێبـوردنی لێکـرد، وابیردەکەمـەوە هەڵـەی بیـستنی لەدەموچـاومدا خوێنـدەوە لەبەر ئەوەی بزەیەکی کردووتی:

وابزانم بۆگوێگرتن ئامادەی، دایکم هەستاو وتی:

هـەتا سـەفەرەکەت دەگێڕییـەوە مـن نـانی شـەو ئامـادە دەکـەم، پـێم خـۆش بـوو دایکـم رۆیـشت، لەبەرئـەوەی ئـەو دەیتـوانی لەبەیانیـەوە سـەفەرەکەی بگێڕێتـەوە، نـەمتوانی پێـشبەخۆ شییەکەم بگـرم و وتم: تاکو دایکم نەهاتۆتەوە بۆم بگێڕەوە، هێندێك خـۆی لەسـەر قەنەفەکە جووڵاندو وتی:

ئێوارەی چوارشەممە لە سەر کورسییە کەی نزیك دەرگادێرینەکە دانیشتبووم‌و سەیری ئەو پارچە چەرمەم دەکرد کەبەدەستمەوە بوو، بـەنیازبووم لەپەراوێزەکانیـدا چـەند لقێـك گـوڵ وێنـە بکـەم، لـەنێو قسەکەیدا لێم پرسی:

لەسەر چـەرمەکە چیت وێنەکردبوو؟ لـە وەڵامدانـەوە خـۆی بـواردو وتی:

تاقەتم چووبوو، دەمەویست، خۆم بەوێنە کێشانەوە خەریك بکەم، هەسـتام بـۆ ئـەوەی فڵـچەو رەنـگ بێـنم، هەسـتم بەمانـدووبوون کـرد، دەتگـوت ئیـشێکی قورسـم کـردووەو پێویـستە پـشویەك بـدەم، لەجێگەکەم دانیشتم و چاوم لەسەریەك دانان، وام بەبیرداد‌ێ

لەو دەمەیـدا کـە چـاوم لەسـەر یـەك دانـان بیری نـارمینم دەکـردەوە چاك نازانم، بەڵام کاتێك لە گەڵیدا بەرەو روبووم، لەوەی کە چاوم پـێ

کەوتبوو، خۆشحاڵ بووم بە یەکەوە ڕێکەوتین ئە مجارەیان ئە سپێك لەکایەدا نەبوو، منو ئەو بە پێیان بەڕێکەوتینو دەستمان بە قسە کردن کرد، من لەم کاتەدا ئارەزۆی هاودەمێکم دەکردو بۆ ئەم مەبەستە کێ لە براکەم باشترە؟ لە زۆربەی ڕێگەکەدا من قسەم کردو ئەو تەنیا گوێی گرتبوو، باسی هەموو جێیەكو هەموو کەسمان کردو تەنانەت باسی چاکەی دراوسێکان لە کاتی مردنی دایکمدا، هەروا بزانە هەموو شتێکی لە پێشەوە دەزانی لە بەر خۆیەوە هەر دەیگوت دەزانم، کاتێکی هەموو شتێکم بۆ گێڕایەوەو باسی تەنیای خۆم کردو ئەوەی کە دونیام چۆن لە بەرچاو بێواتایەو لەم ژیانە ماندوو بوم، ئارمین بێ ئەوەی قسەیێك بکات چەند هەنگاوم لێدوور کەوتەوەو من نا چار بووم هەنگاوی زیاتر هەڵێنم بۆ ئەوەی بیگەمێ، ئەو جێیەی پیاسەمان لێدەکرد بیابانێکی قاقر بوو، نازانم بۆ وامدەزانی لەم بیابانە دا گوومبووم بەلاّم هەنگاو نانی بە دڵنیای براکەم هیواداری کردبوومو بە دوایدا دەرۆیشتم.

کە هێندێ ڕێگەمان پێوا چاوم بە کوڵێتێك کەوت، ئێستا لێ نزیك نەبوینەوە، ژنێك هاتە دەر ومن دایکم بینی لە بەر دەرگا وەستاوە، ویستم بچم بۆ لایو لە ئامێزی بگرم بەلاّم توانی ئەمکارەم لە خۆمدا نەدەدی، دایکم هەنگاوێك هاتە پێشەوەو بزەیەکی بۆم کردو ووتی:

ماندوو نەبی کورەکەم ! نە مزانی بۆ برینی ئەم هەموو ڕێگەیە بوو یان مە بەستێکی دیکەی هەبوو، کاتێك پێم ووت ماندوونیم، جاریکی دیکە پێم پێکەنیو وتی:

با، ماندوی له بەر منو براکەت کەوتویە ز حمەتی زۆرەوە بەناڕەحەتیەوە وتم: دایە دیسان دەستت بەم قسانە کردەوە، دایکم سەری لە قاندو وتی:

وامەزانە منو براکەت ئا گادارینو هە مووشتێکمان دیوەو دەزانین تەنیای ماندووی کردووی، مرۆڤی تەنیا لە بیابانی ژیاندا خۆی لێگوم دەبێت، تا ئێرە ژیانێکی بێبەرو بۆمت تێپەڕ کردووە، کەوایە بیگۆڕە، دەمزانی مەبە ستی دایکم، ژنهێنانەو پێکەوەنانی بنەماڵەیە، ویستم قسان بکەم کە سەیرم کرد دایکمو ئارمین هەردووکیان ڕۆیشتوونو من تەنیا لەم بیابانەدا جێماوم، نە مدەزانی بەکامە ڕێگادا بڕۆم کە دەنگێك هێنامیەوە سەرخۆم، لە کاتێکدا لەسەر تەپۆلکەیەك وەستابووم، لەمەودایەکی نەك هێندەش دووردا پیاوێك ماشێنەکەی چاکدەکردەوە، باش سەیری دەوەروبەرمکرد، ڕێگەیەکم بینیو زانیم لەدەرەوەی شارم، توانای ڕۆشتنم نەبوو، لەسەر تەپۆلکەکە ڕۆیشتم بۆئەوەی هێزم بێتەوەبەر، کاتێك توانیم بەڕێگەدا بڕۆم بۆئەوەی بزانم لەکوێم چوومە لای پیاوەکەو پرسیم:

ئەم ڕێگەیە بۆکوێ دەچێت؟. بەگومانەوە سەیرێکی کردمو وتی:

ڕێگە کۆنەکەی ((سگەر ئاوا )) یە. پرسیم:

ئەمرۆ چەند شەممەیە؟ سەری سورمابوو، وایدەزانی شێتمو لەشێتخانە هەڵاتووم، پرسی:

لەکوێوە هاتووی؟ لەمەبەستەکەی تێگەیشتمو وتم:

خاتر جەمبە شێت نیمو لەشێتخانە رامنەکردووە، پاشان ناچاربووم درۆی لەگەڵدابکەمو بڵێم، دووکەس رفاندویانمو پارەکانیان لیٚ سەندمو لەم بیابانە بەرەڵایان کردمو رۆشیتن،

پیاوەکە هەناسەیەکی ئاسوودەی کێشاو پەرداخێکی ئاو بۆهێنام ووتی: شوکری خوا بکە کەتەنیا پارەکەتیان بردووەو هیچیان لەخۆت نەکردووە قسەکەییم تەئکید کردو جارێکی دیکە پرسیم:

ئەمرۆ چەندشەممەیە، پێکەنی ووتی:

ئەمرۆ هەینی یە، ئەم ماشێنەش هی برادەرێکمە، بەڵێنم پێداوە بۆی چاکبکەم،

ئەگەر ئیشەکەم تەواوکردبایە لەگەڵ خۆمدا دەمبردییەوە شار، سوپاسم کردو وتم:

پێویست بەزەحمەتی تۆ ناکات، دەتوانم بگەرێمەوە، پیاوەکە هێندی پارەی دامیٚ و وتی:

بگرە، بۆ کریٚ پێویستت دەبێت، نەمدەویست وەری بگرم، بەلاٚم بەزۆری پارەکەی دامیٚو گەرامەوە بۆماڵ، پرسیم:

ئێستا دەتەویٚ چیبکەی، لەوانەیە دیسان سەفەری وات بێتەریٚ وجارێکی دی لەنێوجادە داچاوت هەڵێنی، ئایە واباشتر نیە فیکریك لەحالیٚ خۆتو ئەودەرگایە بکەیتەوە

هێندێك بیری لێکردەوە وتی:

ئەم رووداوەی روویداوە خستومیەتە سەر ئەو بیرکردنەوەیەی لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوە بکەمو بگەمە ئاکامێك، پرسیم:

ئەم دەرگایەت لە کویٚ بوو؟ وتی:

هی مامۆستا دێرین ناسەکەم بوو، چەند ساڵ بەر لە ئێستا مرد. پێش مردنی دەرگاو قفڵەکەی پێ بە خشیم‌و داوایکرد هەڵیگرم، پرسیم:

گلێنەو پیاڵەکانیش هی ئەو بون؟ گووتی، نا پاشان درێژەپێدا:

نا، ئەوانە میراتی بنەماڵەکەمن، وتم:

من لە نێوان دەرگاو گلێنەکەدا پەیوەندییەك دەبینم، لە هەردوو گەشتەکانمدا تینووبووم لەگەڵ ئەوەیدا دەمزانی گلێنەکە خاڵییە، بەلاّم لێم خواردەوە، لەوکاتەدا هەستم دەکرد شەربە تێکی سارد دەخۆمەوەو هەستم بە ئا سودەی دەکرد،

ئاغای سەبووری پێکەنی‌و وتی:

لەوانەیە شروبێکی ئارامبە خشت خواردبێتەوە! منیش پێکەنیم وتم:

هیچ دوور نیە چونکە پاش خواردنەوەی، خەودایدەگرتم‌و لە دوای ئەوە سەفەرەکە دەسی پێدەکرد. ئاغای سەبووری بزەیەکی کردو وتی:

من سەفەرم بە گلێنەوە تا قینەکردوّ تەوە، لە وانەیە لە گەشتی داهاتووم کەڵکی لێوەربگرم، لانیکەم تینووم نابێت، هەردوکمان بەم بڕیارە پێکەنین، دایکم بانگیکردم بۆ ئەوەی سفرەکە رابخەم‌و وتوێژەکەمان بە نیوەچڵی مایەوە.

ئەوەی بۆ من‌و ئاغای سەبووری روویدا بوو لە بازنەی بیرو خەیاڵ بەدوور بوو، هەردوکمان لە گەشتەکەماندا لە گەڵ مرۆڤێکدا بەرەو رربوین کە مردبوو، گەرچی من تەنیا ئارمینم بینی، بەلاّم سەبووری

لـه گـەڵ ئارمینـدا دایکیـشی دیتبـوو قسەی لـە گەڵـدا کـرد بـوو. مـن بڕوایەکی ئەو تۆم بە رووحی دوای مـردن نـەبوو، بـەڵام بـەم رووداوە، بروام کـرد کـە مـرۆڤ پـاش مردنـی بـە شـیوەیەکی تـر درێـژە بـە ژیـانی دەدات، کـاتی خواحـا فیـزی، دایکـم داوای لـە سـەبووری کـرد زیـاتر ئاگـای لـە خـۆی بێـت، منـیش ئـەم داوایـەم لێکـردو لـە ئـەنجامی لێکۆڵینەوەکەی ئاگـادارم بکاتـەوە، بـە یـانی ڕۆژی شـەممە کاتێك بـە مەبەستی چوون بۆ

دایـرە لـە مـاڵ دەرکـەوتم، هاوکـات پێکـەوە دەرگاکانمـان داخـست، سڵاوو بەیانی باشمان لەیەك کردو بەیەکەوە ڕۆیشتن، پرسـی دوێنـێ شەو ئیسراحەتی باشت کرد؟ وتم:

زۆرنا چونکە بیرم لەتۆ دەکردەوەو نیگەرانی ئـەوە بـووم نـەکاتێکی دی بچییەوە گەشت و گوزار. بزەیەکی کردووتی:

بـۆدوور کەوتنـەوە لەسـەفەرێکی تـر نەچـوومە ژوورەکـەوە، بـەڵام منـیش نـەمتوانی وەك تـۆ پـشووبدەمو بـیری چـەرمە ونبووکـەم دەکردەوە،

وتم:

لەوانەیە لەبیابانەکە لێم کەوتبێت، وتی:

لەوانەیە، بەڵام شتێکی دیکەش هەیەو ئـەوەی کەچۆن ئـەم هـەموو ڕێگایـەم بریـوە بێئـەوەی لەگـەڵ کەسـێك یـان شـتێکدا بـەرەو رووبم و لەم هەموو ڕێگەیەی پێیـدا ڕۆیشتوم هیچی لێنـە بووە؟ نەماشێن نـە ڕێبوار؟ وتم:

لەوانەیە لەبەرئەوەی شەو چووی بۆسەفەرەکەت، واپێکهاتووە، وتی:

بەڵام دەبێت بەچەشنێکی تر ڕێگەکەم بڕیبێت، ئەگەر بڵێین لەبەرئەوەی شەوبووە ئوتومبێل یاخود ڕێبوارێکم نەبینیوە، بەڵام خانوو، جۆگا، دەشێت خادوو درەختو رووبارو شتی وام لەسەر ڕێگەبووبن چونك لەم کۆسپانە تێپەڕبووم؟ لەوانەبوو چاوم بینیبێتی بەڵام هۆشم لەلایەکی دیکەبووبێ کەئەمەش لەگەڵ عەقڵدا یەکناگرێتەوە، چونکە کاتێك چاوم شتێك دەبینێت، مێشکم ئاگادار دەکاتو هەستکردن پێویستە لەکۆنترۆڵی مێشکدا بێت، مەگەر ئەوەی من لەماڵەوە یەکراست چووبێتمە بیابانەکە، پێکەنیم و وتم:

لەوانەیە فڕیبی وتی:

شتێکی وایە. وتم:

ئەی بۆ لەباغێکی پڕ لەگیاو گوڵدا نەهاتوویتەدەر وبراکەت تۆی لەبیابەنەکەدا بەرەڵا کردووەو ڕۆیشتووە؟ شانی هەڵتەکاندنو لەبن لێوانیەوە شتێکی وت لەوانەیە لەدونیای راستیشدا پێم بڵێ ژیان بیابانێکی بەرەو هووتە، ئارمین ڕووەکەی دیکەی سکەکەی نیشاندام، بەڵی دەبێت ئەوە بووبێت !کەگەیشتمە سەرەوەی جادەکە پاسەکەی من هاتو بەپەلە خواحافیزیم لێکردو سواربووم.

ڕۆژی هەینی بەبێ ئەوەی بانگی کەین میوانی ئێمە بوو، پێدەکەنیو هەواڵی دۆزینەوەیەکی پێدام، لەوماوەی دایکم لەودیوەکە چووە دەر روی تێکردم ووتی:

ئاگادارییەکـەم لـەدەرگاو قفڵـە دەسـتکەوتووە خـراپ نیـە تـۆش بیزانی، کاتێك زانی بەتاسەوەم وتی:

ڕۆژی یەکشەممە چوومە دیـدەنی هاوسـەری مامۆسـتاکەمو لـەنێو قسەکاندا هێندێ شتم لەمـەر دەرگاکـە لێپرسـی، هاوسـەری مامۆسـتا وتی:

چەند ساڵ بەرلەئێستا، مامۆستا کاتی گـەران لـەبازاڕی ((دێهلـی)) دا چاوی بەم دەرگایەدەکەوێتو وەك خۆی دەیـوت هێنـدە موعجیبی بـوو بـەنرخێکی گـران دەیکڕێـت، دەرگـا دارینەکـە هێنـدەش بـەنرخ نەبوو کەمێردەکەم هێندە پارەی پێبدات، چونکە نە نەخش ونیگاری پێـچاو پێـچی تێدایـەو نەپارچـە ئاسـنەکانی زێـڕن، مامۆسـتا خـۆی دەیزانی هێندە بەنرخ نیە، بەڵام هەروەك وتم چونکە رواڵەتەکەی پـێ جوانبووبوو، کڕیبووی، پاشـان هێنـدە هۆگری پـێ بـوو کـە دیـوێکی بۆتـــەرخانکردو کەدەچـــۆدەرەوە دەرگـــای دیوەکـــەی دادەخـــست وکلیلەکەی لەگەڵ خۆیدا دەبرد.

لەهاوسەری مامۆستاکەم پرسی:

ئایـــا دوای هێنـــانی ئـــەم دەرگایـــە، گورانێکـــت لەهەڵـــسوکەوتی مامۆستادا بەدی نەکرد؟ هنیدێ بیری کردەوەو وتی:

تەنیا جارێك، ئەویش ڕۆژێك دەنگی شـکانی شـتێك هـات، چوومـە ژورەکـە بـەو پـەڕی سەرسوڕمانەوە دیـم مـامۆ سـتا سـەیری هەیکەلی ئەسـپە باڵدارەکـەی دەکـات، مامۆسـتا ئـەو هەیکەلـەی زۆر خـۆ شدەویـستو بیرمـە وێنەکەشـی دابـەتۆ، قـسە ك یـم تەئکیـد کـردو پرسیم:

ئا یا توانیت هۆی شکانی هەیکەلەکە بزانی؟ هاوسەری مامۆستا وتی:

کاتێ هەیکە لە شکاوەکەم بینیو سەیری دەموچاوی مامۆستام کرد وام هاتەبەر چاو لە خەو هە ستا بێتو ئاگای لە کرداری خۆی نیە ، لێم پرسی " هەیکە ل کە بۆ شکا " لە وەڵامدا ووتی: " نازانم لە وانەیە خەوم لێکەوتبێتو دەستم بەری کەوتبێتو بەرمدابێتەوە " پاش ئەوە روداوێکی تر رووی نەداو لەو کاتەوە مامۆ ستا دەرگای ئەو دیوی داخست، ئێستاکە بیری لێ دەکەمەوە وابزانم ئەو لە کەسێکیان دەترسا، لە وانەشە ترسا بێت لە وەی نەکا کەسێك شتەکەی لێ بدزێت، چاکنازانم بەڵام جار جار ئاگادار کردنەوەی مامۆستا دەی ترساندمو ئەوەی زۆری پێدادەگرت دەست لە دەرگاکە نەدەمو لێی نزیك نەبمەوە، منی دەخستە سەر سوڕمانەوە، لەهاوسەری مامۆستام پرسی: مامۆستا قەت باسی گەشتووگوزاری نەدەکرد ؟ سەرسورمانی هاوسەری مامۆستاکەم هێنامیە سەرئەو قەناعەتە قسەکەم بگۆرم و لێی پرسیار بکەم: ئایامامۆستا باسی هەرێمێکی نەناسراوی نەدەکرد؟ نێو چاوانی تێکناو وتی: جاریوابوو دەچووە ناو خۆیەوەو جەستەی دەلەرزی قسەی دەکردن و باسی مەرگ و ژیانەوەی دوایی دەکرد، لەکاتی ئەوتۆدا بەتەواوەتی هیوای لەدونیا دەبراو هیوای ژیانی لەدەست دەچوو. وابزانم لەکەسێك یاخود لەشتێك دەترسا، لەوانەشە لەمەرگ ترسابێت، نازانم! بەڵام شتێکم سەبارەت بە هەرێمی نەناسراو لێنەبیست. کاتێك دەرگاکەی دابەتۆ

نـازانی چـەندە خۆشـحاڵبوم چـونکە نەمـدەزانی پـاش مامۆسـتا دەرگاکـە چ لێبکـەم. بـۆم دەرکـەوت ئەگـەر زیـاتر لەمـە سـەبارەت بەدەرگاکـە لەگـەڵ هاوسـەری مامۆسـتادا وتوێـژە بکـەم بەشـك دەکـەوێت، کەوانەیـە پرسـیاری ئـەو تۆبکـات کەنـەتوانم وەڵامـی بدەمەوە، ئەوەبوو قسەکەم گۆری باسی شتێکی دیکەم هێنایەگۆرێ. کـەدایکم هاتـەوە ژوورئێمـەش ناچـاربووین باسـی شـتێکی دیکـە بکەین و باسکردن لەدەرگاکە بۆکاتێکی دی هـەڵگرین، لای خـۆم بیرم کـردەوە کەبێـشك مامۆسـتاش چـۆتە گەشـت و گـوزار هـەر بۆیـەش دەرگـای دیوەکەیداخـستووە بۆئـەوەی هاوسـەرو منـداڵکانی تـوخنی دەرگاکـە نەکـەون، حەزمـدەکرد ئـەویش زینـدوباو باسـی سـەفەری بۆکردبـام و بیوتایـە چۆتە کوێ و لـەوێ چـاوی بـەکێ کەوتووە، ئایا ئارمینی دیوە؟ بەلأم نـا، وەك دەردەکەوێت مامۆسـتا زووتـر لـەئارمین مردووە. کەوایە نابێت ئارمینی دیبێـت، لەوانەیـە جێگـەی ئـەم دوانـە لەگـەڵ یەکتریـدا تووشـی گـۆران بووبێـت، بـەلأم ئـەو لەگـەڵ کێـدا رووبەرووە؟

لـەبیر کردنـەوەی بێئاکـام مانـدووبووم و بـەم بیرەوە کەئاخرەکـەی هەموو شتێك ڕووندەبێتەوە، دڵنیاییم دەدابەخۆم.

دووا ڕۆژەکانی پایزمان تێپەڕدەکردو بەدەگمەن ئاغای سەبووریم دەدی. ئەمە مانگێکی ڕەبەقە چووە بۆسەفەرو کاتێکی گەرایەوە بەراپەراندنی کاررەکانیەوە خەریکبوو، منیش خەون وخەیاڵم وەلادەناو بیرم لەشتی دیکەی پەیوەندیدار بەداهاتووم دەکردەوە، هاوکارێکی ئیدارەکەم هاتبو بۆخوازبێنم و دایکم بۆهاوسەری من بەشیاوی دەزانی، ئەو پیاوێکی نەجیب وئارامبوو وخوازیاری ژیانێکی سادەبوو،.بۆ قبووڵ نەکردنی داخوازییەکەی هۆیەکی ئەو تۆم شك نەدەبرد وخۆشم بۆژیانێکی نویٚ ئامادەبووم، هەر بۆیە خوازبێنی لەکەش وهەوایەکی دۆستنەدا بەئەنجام گەیشت وهەردوو بنەماڵە بیروڕای یەکتریان پەسەند کرد. دایکم هێندێکی شیرینی بردە ماڵی ئاغای سەبووری‌و هەواڵەکەی پیٚ ڕاگەیاند. کاتی گەرانەوەی وتی:

ئاغای سەبوری بە چەشنێك خۆشحاڵبوو وچەند جار بەدوایی یەکدا دووپاتیکردەوە: ((ئینشائەللاٚ پیرۆزە )) قسەی دایکم ئەم دڵنیایی یەی بێدام کەئاغای سەبوری هیچ دڵی بەمنەوە نیەو وێنەی سەرچەرمەکەش بەهەڵکەوت بووە.

ڕێوشوێنی مارەبرین ئەنجام نەدرابوو، بەڵام بەهامووشۆی سەلمان بۆ ماڵمان هەموو هاوسێکان زانییان دەزگیرانمەو بەم زوانە مارەم دەکات، ئەو چاکەیەی سەلمان بەنیسبەت دایکمەوە دەینواند بو بەهۆی ئەوی دایکم سەبووری لەبیر بەرێتەوەو بیری لێ نەکاتەوە، زۆربەی ئێواران سەلمان من ودایکمی دەبرد بۆپیاسەو شەودەگەراینەوە، ئەم بەرنامەیە تا زستان هەر دریژەی هەبوو بریارماندا حەفلەی مارەکردن ڕێکخەین چەند ڕۆژ بوو زستان هاتبوو بەفرێکی قورس باریبوو، شەو کاتێك سەلمان و دایکم لەپێش مندا چوونە ژوور، من گەرامەوە بۆئەوەی دەرگاکە داخەم، هەستمکرد ئاغای سەبووری لەبەر دەرگای خۆیان راوەستاوەو سەیری من دەکات، بەئیشارەتی سەرم سڵاوم لێکرد، بەڵام ئەو هەر ئاوا لێم رامابوو ناچاربووم بەدەنگ سڵاوی لێبکەم، بەڵام دیسان هیچ کردەوەیەکی لەخۆیدا نیشان نەدا. لەزرم هاتێ بەبیرم دلهات دەبێ خەوتبێ، بەئارامی لێی نزیکبووو مەوەو بانگم کردو تەنانەت شانم راچڵەکاند، بەڵام ئەو وەك هەیکەلێکی بێگیان راوەستا بوو، دەمزانی دەبوو لەخەو رایپەرێنم، چونکە لەوانە بوو بە جلی خەوەوە بچێتە سەرجادەو بەم سەرمایە گیانی لەدەست بدات، کلیلی ماڵەکەم هەربەدەستەوە بوو چەند جار لەدەرگاکەم راکێشا بۆئەوەی لەدەنگەکەی خەبەری بێتەوە، بەخۆشییە دەنگەکە لەخەوی هەستاندو بەدیتنی من کەلەپەنای راوەستابووم بەسەرسوورمانەوە پرسی:

لێـره چ دەكـەی؟ دەنگەكزەكـەی ئەمـەی تێگەیانـدم دوچـاری كـزی پـاش سـەفەر بووە، بۆیـە سـكم گـرت بۆئـەوەی نەكـەوێت، بـەئارامی بـەرەو ژوورەكـەییم بـردەوەو لەسـەر تەختەكـە رامكێـشا ئـاهێكی هەڵكێشاو دەیویست قسان بكات وتم: هیچ مـەڵێ، تـەنیا پـشووبدە، دەمزانی دایكم لەنـەبوونی مـن نیگـەران دەبێـتو لـەماڵ دەردەكـەوێت بەپەلـە چـوومەوە لای ماڵـەوەو بـەدایكم وت: دایكـە! بـۆ كاتـژمێرێك بەلای ئاغای سەبووورییەوە دەبم، دایكم بەسەرسورمانەوە پرسی:

بەم كاتی نیوە شەوە چ كارێكت بەسەبوورییە؟ وتم:

كارێكەو پێویستە رێنوێنی لێ وەربگرم دایكم بزەیەكی كردو وتی: بێشك دەتەوێ ئاگارییـەك سـەبارەتب ەخووی پیاوان بەدەست بێنی بۆئـەوەی سـەبەینێ سـەلمان دورچـاری هەڵـە نـەبێ، چاكم هـەڵهێنا؟ !بەسەر قسەكەییم تەئكید كردو وتی:

زۆرباشە بچۆ بەلاّم زۆری درێژ مەكەوە چونكی زۆرم خەودێ، وتم:

كلیلەكـەی لەگـەڵ خۆمـدا دەبـەم ئەگـەر خـەوت هـات بخـەوە، ئەمـەم وت ودوبـارە چـوومەوە مـاڵی سـەبووری، ئاغـای سـەبووری هـەر لەسـەرتەختەكەی بـوو، بـەلاّم چـاوی هـەڵێنابوون وسـەیری هـۆڵی خانووەكەی دەكرد. بەئارامی وتم:

دەتوانم بێمە ژوور؟ سەری وەرگێراو وتی:

فەرموو، دەیویست هەستی بەلاّم نەمهێشت و وتم:

تكات لێدەكەم بحەسێوە. پەرداخێكت ئاو بۆبێنم؟ بزەیـەكی كـردو بەم دەنگە كەزەیوە وتی:

نا بەئەندازەی پێویست لەگلێنەکە خواردومەتەوە تینوم نیە. بڕۆم تێکنان، وتم:

ئەی تۆ نەدەوت زۆرچونە سەفەر دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ تێك بچێت، ئەی بۆ درێژە بەم سەفەرانە دەدەی؟ بزەیەکی هاتە سەرلێوان‌و وتی:

من هەمیشە بەتینوێتی دەچمە سەفەر، بەلاّم ئەمجارەیان وەك تۆم کردو پەشیمانیش نیم، ئەم جارەیان چووم بەهەشت بوو خۆزگە قەت خەبەرم نەدەبوەوە. لەوێ هەموو ئاواتەکان هاتبوونەدی. ئاخ! نازانی چەندەسەفەرێکی خۆشم کرد! پرسیم:

چاوت بەبراکەت کەوت؟ سەری جوولاّندو وتی:

نا، ئەمجارەیان براکەمی لێنەبوو بەڵکو لەگەڵ مرۆڤێکدا هاودەنگ بووم کەزیندویەو لەداهاتوویەکی نزیکدا ژیانێکی نوێ دەست پێدەکات لەمەبەستە کەی تێگەیشتم‌و وتم:

من لەم بیابانەدا چیم دەکرد؟ خۆمن نەمبردیە بیابانەکە ؟ چەندجار سەری جوولاّندو وتی:

نا،نا، تۆ منت بردە کۆشکی هیواو ئاواتەکانت‌و خۆشم هێنامیەوە تۆ لەنێو دەرگای حەوشەکە ڕاوەستابووی‌و لەشوێنێك ڕامابووی. وتی:

دەتزانی سەیری کوێم دەکرد. لەم کاتەدا ئامادەبووم رۆحم بێتە دەرەوە لەم حاڵەتە نەیەمەدەرەوە. سەرم چەند دەیەشێت. بەدەنگی بەرز پێکەنیم‌و وتم:

کاری ئەوشەربە تەبوو. دەبوو قومێکت کەمتر بخواردایەتەوە. ئەویش پێکەنیو وتی:

ئەگەربمزانم دیسانەوە ئەم خەونە دەبینمەوە هەموو گلێنەکەم فڕدەکەم. وتم:

حەزدەکەی باسی ئەم سەفەرەم بۆبکەی؟ ئەگەر من لەم سەفەرەتدا هاودەمت بووم پێویستە بزانم چی رویداوە؟ هەوڵمدا لەسەر تەختەکەی دانیشێت ولەم حاڵتەدا ووتی:

ئەم گەشتە بۆمن چێژی تێدابوو، بەڵام لەوانەیە بەبیستنی ماندوو ببیت. کەوایە با نەیگێڕمەوە. بەڵێن بێت گەر چومە سەفەرێکی دی وتۆشم لەگەڵدابووی ئەوەی دیومەو بیستوومە بۆتی دەگێڕمەوە. وتم:

ئێستا کەحەز دەکەی وابێ باوابێ. قسەیەکم نیە بەڵام تکایە ئەم سەفەرانە درەنگاو درەنگ بکەو بیری منیش بکەوە. من کەناتوانم بەدایمی لەبیری تۆدابم بزەیەکی کردو وتی:

بیرم مەکەنەوە. هەروەك تۆو دایکت دوو مانگە فەرامۆشتان کردووم. تۆ دەبێ بیری خۆت وئەو ژیانە نوێیەی دەستپێدەکەی بکەیەوە، کەوایە من فەرامۆش بکەو نیگەرانی باری من مەبە لەوەی کەیارمەتیت دامو بردتمەوە سەرجێگاکەم لێت مەمنونم، شەوباش لەلای منەوە سڵاو لەدایکت بکە !

ئاغای سەبووری بەم قسەیەی لەماڵەوە زۆربەنهێنی لەماڵەکەی وەدەرینام گەڕامەوە بۆماڵ دایکم خەوتبوو، نەیزانی گەراومەوە. بەیانی لەسەر سفرەی بەرچای پرسی:

سەعات چەند گەڕایەوەماڵەوە؟ وتم:

زۆرنەمامەوە،لەبەرئەوەی زانیم ئاغای سەبووری خەواڵووە، هیچم باس نەکرد هێشتمەوە بۆکاتێکی لەبارتر. ئاغای سەبووری لێمان تۆراوەو دەڵێ فەرامۆشتان کردووم دایکم لەسەر سفرەکە وتی:

هەقیەتی، لەوڕۆژە وە سەلمان هاتۆتە نێو ژیانی ئێمەوە فەرامۆشمان کردووە هەرئەمڕۆ دەچم بۆسەردانی ئاشتی دەکەمەوە هەستامو وتم:

ئەوپیاوێکی چاکە هۆگریم پێیەتی. قسەکەم بەمەبەستێکەوە نەکرد، بەڵام دایکم بەجۆرێکی دیکە لێی تێگەیشتو بەسەرسووڕمانەوە پرسی:

مەبەستت چییە؟ وتم:

هیچ، مەبەستم ئەوەبوو ئەگەر ڕۆژێك هاتبایە خوازبێنیم ڕازی دەبووم. دایکم لێوی گەستو وتی:

جاێکی دیکە ئەم قسەیە دووپات مەکەرەوە. دەزانی ئەگەر سەلمانیش ئەم قسەیەی ببیستایە چی دەکرد؟ بەلەخۆ ڕازیبوونەوە شانم هەڵتەکاندو وتم:

ئەوپەری دەزگیرانیەکەی تێك دەدایەوە. قیروسیا. دایکم پرسی:

نارەحەتبووی؟ وتم:

نا، بۆنارەحەتبووم، هێندەی هۆگری سەبووریم بەنیسبەت سەلمانیشەوە لەدڵی خۆمدا هیچ هەست بەخۆشە وەیستی ناکەم.

لەوانەیە ڕۆژێك خۆشم بوێت وابزانم پاش مارەکردنەکە وای لێبێت بەڵام ئێستا ئەم هەستەم بەنیسبەت ئەوەوە نیە، دەستی لێکدان و وتی:

تۆ کەخۆشت نەدەویست بۆ بوویە دەستگیرانی؟ بۆبەکارە داهاتووی خۆت تێکدا؟ پێکەنیم وتم:

دایکە بۆ تووڕە بووی، ئێستا نەئاغای سەبووری هاتۆتە خوازبێنیم و نەدەزگیرانیەکەشم تێك داوەتەوە ئەوانەی باسمکرد شتی فەرزی بوون. تووخوا دەموو چاوم لێ تێك مەنێ !

دایکم وتی:

نازانم دوێنێ شەو چی ڕویدا کەتۆ واگۆڕای. تا دوێنێ سەلمان باشترین پیاوی سەر زەوی بوو. من کەی وتم سەلمان باشترینەو کەی تاریفی سەبووریم کرد کارێکی وادەکەی قسەی دڵی خۆمت بەلاوەنەدرکێنم، ئەگەر رای منت دەوێ، لەسەر ئەم بڕوایەم پیاوی باش لەدوونیادا نیە. ئەمەم وتو کیفەکەم هەڵگرتو لەماڵ دەرکەوتم. لەکۆڵانێکدا توشی ئاغای سەبووری بوومو لەسەرخۆ دەڕۆیشتم. لەبەر ئەوەی نەمدی دڵنیا بووم لەسەر خیابانەکە چاوەڕوانی هاتنی ئەمانەی ئیدارەکەیەتی. بەڵام لەوێش نەبوو تائەوکاتەی سواربووم ئەو هەر نەهاتبوو. بەدڵە ڕاوکێوە کارەکەم دەستپێکردو تەنانەت بەساردی وەڵامی، سڵاو بەیانی باشی سەلمانم دایەوە، ئەو هەستی بە تێکچونەکەم کردبوو دانیشتوو پرسی:

شتێك ڕویداوە؟ سەیرم کردو وتم:

نا، بۆ؟ هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو وتی:

کەلە دەرگای ئیدارە کە هاتیە ژوورەوە سەیرم کردی، دەتگووت لەدونیایەکی دیکەدای و ئێستا بەساردی وەلامی سلاوەکەمت دایەوە بۆ ئەوەی نیگەرانیەکەم بشارمەوە پێی پێکەنیم وتم:

هەلەی. من تەنیا ماندووم و دوێوشەویش نەمدەتوانی باش بخەوم ئەم گەرانەی شەوانە ماندویکردووم بەپێی پێویست حەسانەوەم نیە، ووتی :

ئەگەروایە دەتوانی ئێوارەی پێنج شەممە پیاسە بکەین و رۆژی هەینیش هەردووکمان پشووبدەین. چۆنە؟ قبوولی دەکەی؟ پێکەنیم وتم:

بەرنامەیەکی باشە بۆ قبوولی ناکەم و ئەو بەخۆشحالییەوە گەرایەوە سەر ئیشەکەی من وسەلمان هەردووکمان لەئیدارەیەکدا، بەلام لەبەشی جیادا کارمان دەکردو تەنیا نیوەروان لەکاتی نان خواردندا یەکمان دەبینی. کاتێکی دەگەرایەوە بەشەکەی خۆی دەمتوانی هەناسەیەکی ئاسودەبدەم تەلەفوون بۆ مالی ئاغای سەبووری بکەم: بەزەنگی تەلەفوونەکە دیاربووکەئاغای سەبووری لەمال چۆتەدەرەوە وچۆتەشوێنی کارەکەی نازانم بۆچی وام بیردەکردەوە تاگوێم لەدەنگی نەبێت دلم ئاسوودە نابێت. لەبەدالەی ئیدارەکەی ژمارەی تەلەفوونەکەیم وەدەست خست وزەنگم بۆلێدا یەکێك لەهاوکارەکانی گووشییەکەی هەلگرت. کاتێك ووتم کارم بە ئاغای سەبووریە وتی:

لەئیجازەیە. پرسیم:

دەکرێ پێم بڵێی ئیجازەکەی چەند ڕۆژەیە؟ تاوێك ڕاوەستاو پاشان وتی:

حەوت ویەك ئیجازەی وەرگرتووە. ئەگەر کاری پێویستت پێیەتی دەتوانم ژمارەی تەلەفونی ماڵەکەیت بدەمێ. سوپاسم کردوو وتم:

نا، مەمنونم، ژمارەی تەلەفونی ماڵەکەیم پێیە، ببورە موزاحیم بووم وتەلەفونەکەم داناوبەخۆمم وت:

ئەوئیجازەی وەر گرتتوە بۆئەوەی بچێتە سەفەروخوا دەزانێت ئەمجارەیان چی روو دەدات. ئەوڕۆژە نەمزانی چۆن کارەکەم ئەنجام داوە. شانسم نەبوو، لەژمارە هەڵەم نەکردبوو کاتێك گەڕامەوە بۆماڵ پێش ئەوەی بچمەوە بۆماڵ لەدەرگای ماڵی سەبووریم داو چرکەیەك ڕاوەستام وکەدەرگاکەنەکرایەوە جارێکی دیکە دەستم لەسەر زەنگەکە داناودەنگی ئاغای سەبووریم بیست گوتی:هاتم، بۆهێندە زەنگ لێدەدەی؟ هەناسەیەکی بەئاسوودەیم هەڵکێشاو کاتێکی دەرگای لێکردمەوە بێ ئەوەی ئیزنی چوونە ژوورەوە وەربگرم، چوومە ژورو بێ سیّو دوو پرسیم؟

چێت دەکرد، بۆدەرگات لێنە دەکردمەوە؟ هەستی پێکرد نیگەرانو پەشۆکاوم بزەیەکی هاتوو وتی:

خواردنم دروست دەکرد؟ سەرەنجم نەدایە دەنگی زەنگەکە. پرسیم:

بۆئیجازەت وەر گرتووە، ئەمجارەیان نیازی کوێت هەیە؟ وتی:

ئێرە شیاوی لێپرسینەوە نیە ئەگەر ئیزن بدەی بابچینە ژوورێ. من بەرگی شیاوم لەبەردانیە، قسەکەی پێشی بەئاخاوتی من گرتو

تازه بەخۆم زانیبوو خەریکم لێکۆ ڵینەوەی لەگەڵدا دەکەم. هەوڵمدا بەسەر خۆمدا زاڵببم وتم:

داوای لێبوردنم هەیە. نازانم بۆچی والەگەڵتدا دووام، تکایە بمبوورە بزەیکی کردو وتی:

دەزانم بۆچی واتوورەی، هەقتە بەلاّم بڕوابکە خانمی ئازیز نیازی سەفەرم نیە، ئیجازەم وەرگرتووە بۆئەوەی هەم پشوویەك بدەمو هەم ماڵەکەش ڕێكو پێك بکەم. قسەکانم قانیعی کردی؟ وتم:

بێئەوەی بەخۆم بزانم نیگەران ببوم و بەدەست خۆم نەبوو. ئەمڕۆ کاتێك لەجادە تۆم نەدی کەوتمە دڵە ڕاوکێوە،ناچاربووم زەنگ بۆئیدارەکەت لێبدەم کاتێك یەکێك لەهاوکارەکانت ووتی لەئیجازەیە زۆرتر نیگەران بوومو وامزانی دیسان بیری چوونە سەفەر لەسەری داوی. . من ، سەبووری قسەکەی پی ْبڕیم وتی:

مەمنونم نیگەرانبووی من مرۆڤێکی خۆشبەختم کەکیژێکی وەك تۆ بۆم دەسووتیٚ ونیگەرانی چارەنووسی منە. ئێستا وەرە ژووریٚو پیاڵەیەك چا بخۆوە قبوڵم نەکرد وتم:

نا، سوپاس، برسیمەو چا لەزارم خۆش نیە پێم بڵیٚ ئێستا خاتر جەمبم؟ پێکەنی وتی:

بەڵیٚ !وتم:

هیچ حەزناکەم بێمن بچیە سەفەر ئەمەت لەبیر بێت لەسەفەری داهاتوودا منیش لەگەڵت دادەبم سەیری چاوانی کردم وتی:

تۆ هەمیشە لەگەڵمدای تەنانەت لەسەفەریش دا وتم:

بـەڵام ئـەمجارەیان دەمـەویت بەڕاسـتی لەگەڵـدابێم بۆسـەفەرو هـەردوکمان بەیەکـەوە سـەفەر بکـەین بۆدونیـای نەناسـراو پێکـەنی و وتی:

ئێستا کەئەمنیازەت هەیە ڕۆژی سـەفەرەکەی خـۆت دیاری بکـە. وتم:

پێویـستەچەند ڕۆژێـك لەسـەفەری تـۆ تێپـەڕێت بۆئـەوەی گێـرەو کێشەت بۆدروست نەبیٚ. ڕۆژی چوارشەممە چۆنە؟ سەری داخست و وتی:

بۆمن باشە بەڵام تۆ چی بەدایکت دەڵێی؟ وتم:

بـۆ ڕازی کردنـی ڕێگەیـەك دەدۆزمـەوە نیگـەران مەبـەو لەماڵەکـە هاتمەدەر. تیامـابووم بـۆ ئەم پێشنیازەم کـردوو بـۆ دەمـەوێت بـچمە سەفەرێك کەبەنیازی بوم و نەڕێگـەی گەڕانـەوەش شـارەزابووم. ئەگـەر بەیەکـەوە لەهەرێمـە نەناسـراوەکەدا گـوم بووینایـە کـێ دەیدۆزینـەوەو لـەکوێ خەبـەرمان دەبـۆوە؟ ئەوشـەوە تـرس بەسـەرمدا زاڵببـو لەپێشنایازەکەم پەشیمان بووم ڕۆژی چوارشەممە هات. یەکدوو جار بڕیارمدا بچمە چاوپێکەوتنی و پەشیمانیەکەی پـێ ڕابگەیـەنم، بەڵام هـەرجارەی بـیری ئـەوەی کەئـەوم لەگەڵدایـەو پارێزگـاریم لێـدەکات، لەبڕیارەکـەم پاشـگەزی دەکردمـەوە. بـەیانی ڕۆژی چوارشـەممە بەدایکم ووت:

برادەرێك نەخۆشە دەچم بۆسەردانی. ئەگـەر سـەلمان تەلـەفونیکرد بڵێ ئەمڕۆم بۆ بکات بەئیجازە. دایکم وتی:

بۆچی دوای دەوامی ئیدارە ناچیە دیدەنی کردنی؟ وتم:

بەنیازم ئەگەر نەچوبێتەلای دکتۆر خۆم بیبەم. دایکم بەشکەوە قسەکەی وەرگرت من لەماڵ هاتمە دەرەوە، لەوە دەترسام دایکم لەپەنجەرەکەوە چاوی لێم بێت. بۆیە ڕێگەی جادەکەم گرتەبەرو لەیەکەم تەلەفونی سەرجادە، زەنگم بۆسەبووری لێدا بۆئەوەی دەرگای ماڵەکەی بکاتەوە بۆئەوەی بتوانم بچمەژوور. لەماوەی بیست وپێنج ساڵی ژیانمدا بیرم نایەت کارێکم بەدزی دایکمەوە کردبێت یان درۆم لەگەڵدا کردبێت بەڵام ئەم سەفەرەو دۆزینەوەی شتی نوێ ناچاری کردم درۆی لەگەڵدا بکەم بەڵێنم بەخۆم دا هەرئەمجارە بچمە سەفەرو ئیتر ئەمکارە دووپات نەکەمەوە. کەگەیشتەمە سەرکۆڵانەکە بەپەلە خۆم کرد بەکۆڵانەکەداو دەرگام داخست. سەبووری لەپشت پەنجەرەکەوە چاوی لێدەکردم. کاتێك پێم نایە ماڵەکەوە وتی:

وەرە لەپەنا سۆپاکەوە خۆت گەرم بکەرەوە، وتم:

هێندە ترسام ئارەقم کردەوە. وتی:

کەوایە هێندێك دانیشە بۆئەوەی بێیەوە سەرخۆ بۆئەوەی بەئارامی بچینە سەفەرەکەوئێمە ڕێگەیەکی دوورو درێژمان لەبەرە. ووتم :

لەخۆوە دەترسم. دەستی گرتم و لەسەر کورسیەکە دانیام وتی:

بێ هۆنیە منو تۆ دەست دەدەینە سەفەرێك کەلەوانیە گەڕانەوەی بۆنەبێت. ئەگەر دەترسی دەتوانی پەشیمان بیتەوە. وتم:

نا، تازە کەدەستم پێکردوە پێم خۆشە درێژە بدەم، بەڵام حەزم دەکرد کەسێك ئەم بەڵێنەی پێبدام لەتەواوی سەفەرەکەدا تۆ لەگەڵمدای و بەتەنیا جێم نەهێڵی، وتی:

بەڵێ،خۆزگە کەسێك ئەم بەڵێنەی..... وتم:

وەرە دەستمان تێك بخەین، بەم کارە هەردوکمان دەچینە ڕێگەیەکەوە ئەگەر خەبەرمان بۆوە هەردووکمان بەیەکەوە دەبین.

وتی:

ئەمکارە مەترسیدارە لەوانەیەتۆ سەر لەهەرێمی سەوزو جوان بێنیتە دەر لەچۆڵگەیەکی قاقر، ئەمجارە تۆش بەئاگری منەوە دەسوتێی، وتم:

گرنگ نیە دەچمەکوێ گرنگ ئەوەیە تۆشم لەگەڵدابیتو هەردووکمان لە شوێنێك چاوهەڵبێنین. پێکەنی وتی:

مەمنونم کەبڕوام پێدەکەی، زۆرباشە چۆن مەیلت لێیە وادەکەین

وتم:

ئەگەر هەموو دەرگاکان دابخەین چۆن لەچۆڵگە سەردێنینە دەر، ئاغای سەبووری بەدەنگی بەرز پێکەنی وتی:

هێندەی نیگەرانی خەبەربوونەوەی نیگەرانی خەوتن وسەفەرەکەی تۆ منیشی نیگەران کردووە دیسان لێت دەپرسم:

بەڕاستت دەویَ بچینە ئەمسەفەرە؟ سەرت بەنیشانەی پەسەندکردن دانەوێنە. ئاغای سەبووری چوو پەتێکی هێنا لەدەستی خۆی ومنی گرێدا وتی:

کەوایە هەردوکمان بەیەکەوە ئەم سەفەرە دەستپێدەکەینو گرنگ نیە دەچینە کویَ گرنگ ئەم شتەیە تۆ لەگەڵ من ومنیش لەگەڵ تۆدابمو خواش لەگەڵ هەردوکمانە. هەردوکمان سەیری یەکترییمان کردوو پێکەنین ئەمجارە هەستاین دەرگاکەمان لەمشت کردو وتم:

من پێش لەمشت کردنی دەرگاکە شەربەتەکە دەنۆشم، وتی:

مــن لەســـوراحیەکە دووپیاڵـــە بـــەجیا تێدەکـــەمو هـــەردوکمان وادەنوێنین دەی نۆشین. ئەو وتی:

تائێستا شـەربەتی واخۆشـم نەخواردۆتـەوە منـیش هەستمپێکرد چـێژەکەی لەگـەڵ ئـەوەی پێـشودا جیـاوازە. مـن لەماڵەکەیـدا بـوومو ئـەوم لـەلابوو. هەسـتمکرد لەماڵکەیـدا خـەریکی چێـشت لێنـانمو سـەبووریش لەسـەر پارچەچـەرمێك خـەریکی رەسـم کردنـە و مـن لەمەنجەڵی سەر چراکە گۆشتێکم بەسەری چەنگاڵەوەکرد لەبەردەمیم راگرت،

وتم:

لێـی بـچێژە بزانـە بـاش کـوڵاوە یـان نـا؟ چـەنگاڵکەی لەدەسـتم وەرگرتو گۆشتەکەی لەزارینا و تاریفی لـەتامو چێژەکەی کرد. پێم وت:

تامێزی نان خواردنەکە ئامادەدەکەی خواردنەکەش حازر دەبێت. ســـەبووری کارەکـــەی بەجێهێـــشت و بەرازاندنـــەوەی مێزەکـــەوە خەریکبوو. وتی:

رەسمی دەموو چاوت باش دەرچووە. لەپەراوێزەکەیدا چەند گوڵم رەسم کردوون حەزمدەکرد دەموچاوت لەنێو پۆلێك گوڵدا رەسم بکەم ئەمکارەش دەکەم.

وتم:

هـەموو ژوورەکـە پڕبـووە لـەڕسمی مـن ئـەی کـەی هـی خـۆت رەسـم دەکەی؟

سەبووری پێکەنی وتی:

ئەمکارە دەکەم بەلاّم لەپێشدا پێت بلێم ڕسمێکی باش دەرناچێت.

دەستی گرتم وتی:

هەرئەوەندە بزانە تۆ رەسمت کردووە بۆم کافیە. حەزدەکەم ئەو رەسمەی تۆ بکێشمەوەو هەلّی بگرمو بەهەموو عالەمی نیشان بدەمو بلّێم ئەمە رەسمی منە هاوسەرەکەم کێشاویەتی، هەروەك سەیری یەکترمانکردوو من لەقوولاّیی چاوانیدا تیشکی عەشقێکی پاکم بینی وتم:

حەزدەکەم هەمیشە بەوچەشنە سەیرم بکەی‌و زمان نەتوانێت لەسەر چاولێکردنەکەت دادوەر دابنێت، حەزدەکەم هەمیشە لەلام بیت و من بەهیوای تۆوە ژیان بەرێبکەم هەستی پێدەکەم هیچ ژنێك بەقەد من خۆش بەخت نیە دەستم لەسەر گۆنای داناو وتی:

خۆشبەختم هەستێکی وات هەیەو لەم کاتەدا حەزدەکەم لەگەلّەتۆدا لە باغێکی پڕگولّ پیاسە بکەمو بۆنی گولّەکان لەگەلّ تۆدا هەست پێبکەم هەردوکمان چووین لەو دەرگایەی کە چەند تۆپی خڕی پێوەبوون. چوینە ناوباغێکەوە تاچاوهەرەکەتی دەکرد پڕ لەگولّ وگیابوو. لە جادەکە دەست لەناو دەست پیاسەمان کردو هەردوکمان گوێمان سپاردە دەنگی بەسۆزی بالّندەیەك. هەوانەگەرم بوونەساردو دیارنەبو رۆژ لەهەلاّتندایە یان ئاوابوون وادێتەبەرچاو هەوربێت بەلاّم پەلّە هەورێکیش بەدی نەدەکرا. شنەیەکی خنکێنی دەهات ودەنگی ئاوی جۆبارێك کەلە سەرچاوەکەوە شۆڕدەبۆوە دەهاتەبەرگوێ. خۆشحالّ وسەرمەست چوینە ئەوێ هەردوکمان

لەئاوی سەرچاوەکەمان نۆش کرد. بەخواردنەوەی ئاوەکە چاومان لەیەکتری کرد بەیەکتری پێکەنین. پرسی:

ماندووی؟ وتم:

نا، بەخواردنەوەی ئاوو بوونم لەشوێنێکی ئاوادا زیاتر هەست بەشادیو خۆشیدەکەم !چەند خۆشدەبوو منو تۆ لەنێو دارو درەختدا بەچەشنێك کەس نەتوانێت بمان بینێ، شوێنێکمان بۆخۆمان دروست کردبا بۆهەمیشە تێیدا ژیابایناو ناومان لێنا کۆلیی خۆشەویستی هیواو عەشق یان ژیان سەبووری وێستاو سەیری دەورو بەرەکەی کرد وتی:

ئەم جێیەی من وتۆ لێی دانیشتووین کەنار جادەیەو ڕێبواران دەمان بینن وەرە بگەڕێین جێگەیەك بۆدروستکردنی کۆلیتەکەمان بدۆزینەوە هەستاین بەکەنار جادەکەدا تێپەڕبووین بەنێو دارو درەختی بەرزدا گەڕاین. دەنگی ئەو مەلانەی لەسەر درەختەکان هێلانەیان دروستکردبوو دەگەیشتنە بەر گوێ، بۆدۆزینەوەی شوێنێکی باش چوینە پێشەوە لەدوای جادەکەدا گەیشتینە جێگەیەك لەخوار تەپۆلکەیەکەوە بوو تەپۆلکەیەکی سەوزو پڕدرەخت، کۆلیتی دیکەی لێ دروست کرابوون. لەخوارەوەی تەپۆلکەکەدا وادەهاتە بەرچاو کۆلیتەکان لەسەر یەك دانراون، بەلآم کاتێکی چوینە سەرەوە، سەیرم کرد لەداوێنی دا، لەهەر بەشێکی کۆلیتێك دروستکرابوو، پەردەی تۆرەمی پشت پەنجەرەکان، ئەوەی دەگەیاند ئاوەدانن خەڵکی تێیدا ژیان دەکەن، ڕیگەمان درێژە داو بەتەپۆلکەکەدا سەر کەوتین. هەموو کۆلیتەکان ئاوەدان بوون، لەسەر

تەپۆڵکەکە پاڵمان بەقەدی دارێکەوەدا چاومان بڕییە دەشتێکی پان و بەرین کەلەپێشمانەوە بوو، ئەسپە سپیەکەم دی لەدەشتەکەدا دەگەڕا. کەئەسپەکەم بینی بەرەولای هەلاتم. سەبووریش بەدوامدا هات. کاتێک گەیشتینە ئەسپەکە، سەبووری یارمەتیدام بۆئەوەی سواربم وخۆی ئاوساری ئەسپەکەی بەدەستەوە گرت و بەرەو ئاسۆ ڕێکەوتین. لەدەشتەکە تێپەڕبووین چیای بەرزمان بەدی کرد سەریان لە ئاسمان دەخشاند، ڕێگەیەکی بارێک بەرەو لوتکە بردینی، لایەکمان چیابوو لایەکەی دیکە دۆڵێکی هەزار بەهەزار کەسەیرکردنی خستمەیە لەرزینەوە سەبووری بە ترسەوە ئەسپەکەی بەرەو پێشەوە دەبرد جارجار بەردوو چکەیەك لەژێر پێی ئەسپەکە دەردەپەڕی و خلۆر دەبۆوە بۆنێو دۆڵەکە. دەمویست چاوم لێك بنێم بۆئەوەی بەچاوی بەستراوەوە بەم شوێنە ئاستەمەدا تێپەڕم، بەلام بەوردی لە ڕووبەری خۆم ڕامابووم و هەنگاوی سەبووریم لەگەڵ جوڵەی ئەسپەکەدا ڕێکدەخست، کاتێك سەرکەوتین خۆم لەشوێنێکی ئاواڵەو پڕدارو دەرەختدا دیەوە، لەئەسپەکە دابەزیم و بە سەبووریم ووت:

ئێرەباشترین شوێنە !وەرە کۆلیتەکەمان لەژێر ئەم درەختانە دروست بکەین. بەپێکەنینەوە پرسی:

ئایا دڵنیای کەناچیە لوتکەیەکی بەرزتر؟ وتم:

نا، تائێرە کافیە. لێرە هەموو شتێکی لێیە، ڕێگەو ڕۆشتنی زیاتر ماندومان دەکات و دەترسم نەتوانین شوێنێك بۆ نیشتوجێبوون

هەڵبـژێرین. سـەبووری جـارێکی دیکـە سـەیری دەوروبـەری کـردوو وتی:

دەمێنینـەوە کۆلیتەکـەمان هـەر لێـرە دروسـت دەکـەین، پێویـستە کۆلیتێکی مەحکـەم دروسـتبکەین بۆئـەوەی لەهێرشـی ئـاژەڵی دڕنـدە پارێزراو بین، ئەسپەکەم بەرەڵاکردوو چوینە لای درەختەکان. لـەبیری شـوێنێك بـۆ کۆلیتەکـەمان بـووین کەچـاومان بـەدوو پیرێـژن کـەوت گۆچانیان بەدەستەوە بوو، لەچیاکەوە دەهاتنە نێو دەشتەکەو هاتنە لای مـن وسـەبووری، هـەردوکیان لەکارکـەتوبون. چـرچ ولۆچـی دەموچـاویان‌و دەسـتە چـرچ ولەرزۆکەکـەیان ئـەوەی دەردەخـست تەمـەنێکی زۆریـان تێپـەڕکردووە. لەبـەردەم مـن و سـەبووری دا وەستان‌و پرسییان:

دەتانەوێ لەم تەپۆڵکەیەدا نیشتەجێبن؟ سەیری سەبووریم کرد ئەو وتی:

بەڵام ئێرە تەپۆڵکەنیەو ئێمە لەبناری کێوەکە وەستاوین. یـەکێك لەپیرێژنەکان پێکەنی وتی:

بۆگـەنجان ئـەم چـیایە وەك تەپۆڵکەیـە، بۆناچـنە سـەروتر؟ لەلوتکەکانی تردا شتی باشتر دەبینن. پرسیم:

ئایا ئێوە ئەم لوتکانـە شارەزان؟ پیرێژنەکـەی تـر بـەدەنگی بـەرز پێکـەنی بـەدیتنی دادنـە درێـژەکانی ترسـم لێنیـشت مـن وخوشـکم هێندە

بـەم لوتکانـەدا هەڵگـەڕاوین بەچـاوی بەسـتراوەوە دەتـوانین بەهەموویاندا تێپەڕین پێتان دەڵێم کاتی خۆتان لێرە بەفیڕۆ مـەدەن‌و

لەگەڵ منو خوشکمدا ببنە هاوسەفەر. کاتێك بگەنە لوتکە دەبنەحاکم و فەرمانڕەوای ئەم کوێستانەو هەمووشوێنێك دێتە بەردەستی خۆتان لەلوتکەی قەناعەتدا، کەوایە تا درەنگ نەبووەو شەودانەهاتووە بەرەو لوتکەیەکی تربڕۆنو بەئاسوودەی دەتوانن بەوێدا تێپەڕن لوتکەکانی یەك بەدوای یەکدا بگرن. سەبووری وتی:

لەوێوە دەبێ بچینە کام لوتکە؟ پیرێژن جارێکی دیکە بەدەنگی بەرز پێکەنی کەلەکێوەکەدا دەنگی دایەوە وتی:

لەسەر هەرکام لەم لوتکەکانە گاشەبەردێکی زلی لێیەو ناوەکەی لێ نوسراوە. چۆن ئەم نوسراوەتان نەدیوە؟ سەیری ئەم بەردە بکەن. من وسەبووری چاومان لەو شوێنەکرد کەپیرێژنەکە ئاماژەی پێکرد لەسەر تاشەبەردێکی زل نوسراوەی چیای قەناعەتان بینی پیرێژن وتی:

پاش لوتکەی قەناعەت دەگەنە لوتکەی تەماحو پاشان لوتکەی هێزو سامان و. . وئەوێ دواین لوتکەیە بەکاتێکی گەیشتنە ئەوێ ئیتر بێ نیاز دەبنو هەموو دەشتەکە دێتە ژێرکۆنترۆڵی ئێوەوە زوتر حەرەکەت بکەن وکات بەفیڕۆ مەدەن. من سەیری سەبووریم کردوو ئەو لەمنی پرسی:

ئایا حەزدەکەی درێژە بەڕێگەکەمان بدەین؟ وتم:

نازانم، بەلام ئەگەر لوتکەی جوانتر هەن بۆنەچین؟ هەردووکمان بەڕادەی پێویست هێزمان تیایە دەتوانین سەرکەوین سەبووری سەری ڕاوەشاندو وتی:من ڕازینیم، ئێرەش جوانەو لەجادەکەشەوە نزیکترە. ئەگەر ویستمان دەتوانین بچینە دیدەنی دانیشتوانی

تەپۆڵکەکە، بەڵام ئەگەر بەرەو سەرەوە بڕۆین ئەم ئیمکانەمان لەکیس دەچێت، بەڵام ئەگەر هەرسووری، من دەتبەم. سەیری دەورو بەرم کردوو جوانی دەشتەکە لەبەر چاوم گوم بوو مەیلی چوون و دۆزینەوەی زیاترم تیادابوو. بەخۆم وت !لەاونەیە ئەوسەرەوە باشتربێت لێرە. کاتێك ئەسپی باش و ڕێنوێنی باشمان هەیە بۆنەچینە سەرەوە لەوانەیە ئیتر ئەم هەلە دەست نەکەوێتەوە، روم کردە سەبووری وتم: بمبە بۆئەولوتکەیە ئەگەر دیم هەروەك یەکن دەگەڕێینەوەو هەر لێرە کۆلیتەکەمان بنیات دەنێن. سەبووری بەبێ مەیلەوە پەسەندی کرد. هەردووك پیرێژن چاوێکیان لێك کردوو لەپێشەوە حەرەکەتیان کرد، چومە لای ئەسپەکە بۆئەوەی سواربم، ئەمجارەیان لوتکەی هاویشت و نەیدەهێشت سواربم، بەدژواری لغاوەکەیم گرت و سواربووم. ئێستا ئەوێیان جێنەهێشتبوو گاشە بەردێك لەچیاکە جیابۆوە بۆلای ئێمە خللۆر بۆوە. ئەسپەکە هاتە سەرپا شوان و حیلاندی و بەپشتەوە دا خستمیە خوارەوە. دەنگی قرمەی بەردە کە لەسەر بەردەکانی دیکە دابوو، بۆئەوەی چاوم هەڵبێنم وخۆم لەنزیك سەبووریدا بدۆزمەوە زیاتر لە هەنگاوێك لەگەڵ دۆلەکەدا مەودانەبووم ئەگەر هەنگاوێك بەرەوپێش بچومایە بەردەبوومەوە نێو دۆلەکەوە، لەترسان قیژاندم و خۆم کێشایە دواوە نەمدەزانی لەکوێم سەیری دەوروبەرم کردو لەمەودایەکی دوور سەبووریم دی کەبەسەر تاشەبەردێکی کەنار چیاکەدا کەوتبوو، لاوازی هەموو لەشمی داگرتبوو بەشەلە شەل خۆم گەیاندە سەبووری، نێو چاوانی بریندار بوو هێندێك خوێنی لێهاتبوو دەستم

بەســەر چــاویدا هێنــا، گــەرم بــوو. لــەوەی کەزینــدوو بــوو هاتــەوە سەرخۆو بانگم کرد. چاوی هەڵهێناو بەئارامی پرسی:

هیچت لێنەهاتووە؟ بەئیشارەت قسەکەم تەئکید کرد. تەکانێکی بەخۆیدا بۆئەوی بتوانێت دانیشێت، لەم حاڵەتەدا وتی:

ئەگــەر پێــشم بەڕوبونــەوەی بەردەکــە نەگرتبایــە هــەردوکمان کوژرابوین، وتم:

من هەر نەمزانی چی بووە؟ بزەیەکی کردو وتی:

هێنـدێك پـشوو بـدە بۆئـەوەی بتـوانین بـڕۆین. پـاڵم وەبـەردە جیابووەکـەی چـیاکەداو چـاوم لەسـەریەك دانـا. کاتێـك بـەدەنگی سەبووری چاوم کردەوە ئەو ڕاوەستابوو سەیری دەکردم. یارمەتیدام بۆئەوەی لەسەرپێ ڕاوەستم و لەم کاتەدا پرسی:

دەتوانی بەرێدا بڕۆی؟ وامدەزانی ناتوانم بڕۆم. چەند هەنگاوێك ڕۆیــشتم کــاتێکی دڵنیــا بــووم ڕاوەســتام ســەبووری بەزەحمــەت دەڕۆیشت خۆی گەیاندە من و وتی:

وابیر دەکەمەوە لەجادەی باکوربین ئێستا لەکوێین، نازانم، پرسیم:

دەبێ کاتژمێر چەند بێت؟ سەیرێکی ئاسمانیکردو وتی:

وابزانم دوای نیوەڕۆیە. وتم:

هەست بەلاوازی و برسیەتی دەکەم. وتی:

منیش برسیمە،واباشترە لەکەنار جادەکە ڕاوەستین و بگەڕێینەوە بۆ ماڵ بەدوایدا ڕۆیشتم و هەردوکمان لەجێیەك ڕاوەستاین بۆ ئەوەی ماشێن بتوانێت ڕاوەستێ. بەفر سەر چیاکانی سپی کردبوو، بەڵام جادەکــە بــەفری لێنــەبوو. ماشــێنێك تێپــەڕبوو ڕاینــەگرت، بــەڵام

تویێتایەك کەسندووقی بار کردووبو ڕاوەستاو من وسەبووری لەپەنا شۆفێرەکەوە دانیشتین. هەوای گەرمی نێوماشێنەکە ئارامی کردینەوە شۆفێرەکە پرسی:

بەم سەرمایە لێرە چ دەکەن؟ زاراوەکەی باکوری بوو ئەمجا زانیمان لەجادەی باکورین. سەبووری وتی:

بۆسەیری سروشت هاتبوین پیاوەکە پێکەنی و وتی:

سەیری سروشت بێماشێن وئەویش ڕێك لەنێوە ڕاستی ڕێگای تاراندا، بۆپێکەنین دەبێت، ئایا جێگەیەکی دیکە بۆسەیریۆ سرووشت نەبوو؟

سەبووری ووتی:

ئێمە هەردوکمان توێژەرەوەین و بۆتوێژینەوە هاتوین. سەروسیمای ئالۆزاویمان پیاوەکەی قانیع نەکرد وتی:

بەمن چی توێژەرەوەن یان بۆکارێکی دیکەهاتوون، بەلام کارێکی باشتان نەکردووە، بەم هەواساردە، بێ پالتۆ هاتونەتە دەرەوە لەوانەبوو سەرما بتان بات، سەبووری بێدەنگ بوو، پیاوەکەش درێژەی بەقسەکانی نەدا. من لەماندوویا سەرم خستە سەر شانی سەبووری چومە خەوەوە.

کاتێك بەدەنگی سەبووری خەبەرم بۆوە بەدیتنی شەقامی گەڕەکەکەمان خۆشحالبوم لە ماشێنەکە دابەزیم بەم ئالۆزیە نەمدەتوانی بچمە مالی سەبووری بۆئەوەی خۆم ڕێك وپێك بکەم سەبووری وتی: تاخواردنەکە ئامادە دەکەم خۆت بشۆ. ئەم کارەمکرد کاتێك چومە مەتبەخ خاوێن و ڕێکو پێك بو، مێزی نان

خواردنەکەی تەرتیب کردو ئەمجار سەبووری چو بۆخۆشتن کاتێك لەپشت مێزەکەوە ڕۆیشتین هەردوکمان پێکەنین.

سەبووری وتی:

سەفەرەکەخۆشبوو؟ وتم:

سەرەتاکانی زۆرباش بوو بەڵام پاشان......لەنێو قسەکانمدا وتی:

بەڵێ، دەکرا ئاخیرەکەشی باشبێت، ئەگەر بەدەشتەکە قەناعەتتان کردبا ئاخێکم هەڵکێشاو وتم:

بەڵێ، راستدەکەی، من نەمزانی سەفەرەکەم تێکدا، وتی:

هەمیشە تەماح ژیان تێك دەدات ئەو دوو پیرێژنە وەسوەسەی شەیتانی ئێمە بوون و کارێکی وایان کرد ئەمکارە مەترسیدار بکەین.

وتم: تۆ بێ تاوان بووی. ئەگەر من لەبەرامبەر هەوای نەفەسی خۆم ڕابوەستابام سەفەرەکەمان بەم چەشنە دوایی نەدەهات سەبووری ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا وتی:

نا، منیش تاوانباربووم چونکی هەستمکرد بوونی ئەم دووپیرێژنە ناتوانێت بێ هۆبێت و نەدەبوو بتهێشتایە تەسلیمیان بی، جاری واهەیە هەست وسۆز بەسەر مەنتیقدا سەردەکەوێ. من لەم کاتاتەنەدا بیرم لەهیچ نەکردەوە جگەلەوەی بەشادمانت ببینم. وتم:

سەفەرێکی پڕمەترسی، بەڵام پڕدەسکەوت بووین و من دەرسێکی باشی لێ فێربووم. خۆزگە هەموو مرۆڤەکان لەدەشتی قەناعەتدا خێمەیان هەڵدەدا وگیرۆدەی تەماح و چاوچنۆکی نەدەبوون، سوبووری پێکەنی وتی:

پێویسته خەڵك سەفەر بکەن بۆ ئەوەی بەتەجرەبەی تۆ فێربن.

پێکەنیم وتم:

ئەم گەشتە شتێکی دیکەشی فێرکردمو ئەویش ئەوەیە، ئەو هەودایەی مرۆڤەکان بەیەکەوە گرێدەدات، ڕواڵەتی نیە. من وتۆ لەسەرەتای گەشتەکەماندا دەستمان لێك گرێدابوون، بەلام لەنێوان سەفەرەکەدا دەستمان لێك ئاوەڵابوون وبەیەکیشەوە سەفەرمان کردوو لێك جیابووینەوە. سەبووری سەری داخست وتی:

هەودای خۆشەویستی، زۆرمەحکەمەو دۆلەکان لێك گرێدەدات. من لەسەفەری پێشدا لەگەڵ تۆبووم. جەستەت لەماڵەوە بوو بەلام ڕۆحت لەگەڵ مندا بوو، بۆئەوەش بوو لەگەڵتدا بوومە ها سەفەر وتم:

خواوەند مرۆڤی بە جووتە دروستکردوون بۆ ئەوەی لەپەنا یەکتردا بەئاسوودەی بژین. جاری وایە یەکێك لەم سەری دونیایەو ئەوی دیکە لەوسەری دونیا، بەلام هەر ئەو نەدیتراوە ڕۆژێك لەشوێنێك بەیەکەوە پێوەندیان دەبێت، سەبووری وتی:

دۆزینەوەی جووت لەنێوان هەزاران کەسی لێکچوو، دژوارە لەوانەیە تۆ هەودایەکت بەدەستەوە گرتبێ، بەلام نەتگەیەنێتە جووتەکەت و تۆ چۆن مرۆڤێکی دیکە هەڵبژێری. ئەوکارەی تۆ کردووتە دڵی ئێمە پێوەندیان پاراستووە، بەلام تۆ بەگرتنی هەودایەکی هەڵە هەم دەڕەنجێنی، هەم دەبێت یەکێك لەهەوداکان پەرەبدەی، یان هی دڵ یان هی دەست، پاش ماوەیەك بێدەنگی وتم:

توانای کارێکی ئەوتۆ لەخۆمدا نابینم. من ناتوانم هەودای دڵم بەربدەم چونکی بێ ئەو پەیوەندیە ژیان بۆمن بێ بایەخە. پێوەندی دەستیش ناتوانم بەربدەم چونکە پێم باش نیە دڵی مرۆڤێك بشکێنم، ئاخ، بەڕاست نازانم چیبکەم؟ ڕێنوێنیم بکە سەبووری لەپشت مێزەکە هەستا وتی:

بەداخەوە ناتوانم ڕێنوێنیت بکەم. ئەوە تۆی کەدەبێ ڕێگەی خۆت دیاری بکەی. ئەو منی سەرپشك کرد بۆ ئەوەی خۆم هەڵبژێرم‌و من بەسەرلێ شێواوی لەنێوان دووڕیانی چارەنوسدا مامەوە. کاتێکی گەڕامەوە ماڵ دایکم خەیاتی دەکرد وتی:

ئەگەرماندوونیت وەرە یارمەتیم بدە بۆئەوەی ئەم روو باڵخانە زوو تەواو بکەین، دەمەوێ گوڵدۆزیان بکەین. دانیشتم بەئارامی سەیری کاری دایکمم دەکرد، ئەو هەوڵی دەدا جیهازیم بۆ ئامادە بکات‌و منیش لەبیری هەڵبژاردنی یەکێك لەم دووپیاوەدا بووم.

دایکم وتی:

برادەرەکەت چۆن بوو !بردت بۆلای دکتۆر؟ وتم:

پێش ئەوەی پێویستی بەدکتۆری جەستەبێت پێویستی بەدکتۆری دەروونیە. دایکم بەسەر سوڕمانەوە سەیری کردم و پرسی:

برادەرەکەت شێت بووە؟ وتم:

ئەگەرشێتیش نەبووبێت لەسنورەکەیدایە‌و پێویستە یەکێك یارمەتی بدات. دایکم دیسان پرسی:

هۆی ناڕەحەتیەکەی چییە؟ وتم:

ناڕەحەتیەکــە هەڵبــژاردنی ڕێگــەی داهاتویــەتی. ئــەودەزگیرانی پیـاوێکی بـاش ومیهرەبانـە، بـەڵام عەشـقی پیـاوێکی دیکـە بـووە، نازانێـت لـەم دوانـە کامیـان هەڵبـژێرێت. دەزانـی بەبێ بوونـی پیـاوی دووهـەم ناتوانێـت درێـژە بەژیان بـدات، بـەڵام لەلایـەکیش ناتوانێـت دەزگیرانیەکــەی لەگــەڵ ئــەوپیاوەدا تێــك بداتــەوە. ئــەم کێــشەیە برادەرەکــەمی ئـاڵۆزو پەرێـشان کـردووەو توانـای هەڵبـژاردنی نیـە. دایکم وتی:

بـرادەرە کـەت تووشـی خۆشەویـستی کـاتی گەنجییـە. ئایـا پـێش دەزگیرانیەکەی پیاوی دووهەمی خۆشدەویست؟ وتم:

وابـزانم بـەڵێ! بـەڵام لەبـەر ئـەوەی ئـەو پیـاوە باسـی خۆشەیـستی نــەدەکرد. برادەرەکــەم نەیــدەزانی عەشــقەکەی یــەك لایەنەیــە، خۆشەویــستی ئــەوپیاوەی لەدڵیــدا شــاردەوەو بــووە دەزگیرانــی پیـاوێکی دیکـە، بـەڵام ئێـستا هـەردووکیان دەزانـن چـەند بەیەکـەوە بەستراونەوەو ناتوانن جیا لەیەکتری ژیان بکەن دایکم پێکەنی وتی:

نەخۆشـی قـوورس زوونـارەق دەکـات. هـەروەك ووتم برادەرەکـەت گیرۆدەی هەسـت وسـۆزی گەنجیەتیـە. ئەگـەر بم دیبایـە ئامۆژگـاریم دەکـرد کـەژیانی نـوێ لەگـەڵ دەزگیرانـەکی دەسـت پـێ بکـاتو بـیری ئەویتر لەمێشکی دەربکات، لـەکوێ دیـارە ئەمـە عەشق بێت لەوانەیـە هەوەسـێکی کـاتی بێـت، مرۆڤـی ژێـر یـەکێکی ناسـراو لەگـەڵ داهـاتو وێـڵ ناکـات بـۆ ئـەوەی بـە یـەکێکی دیکـەوە بنوسـێت کەتـەنیا ژن

هێنان‌و ژیان بۆخۆی دەستەبەر بکات‌و عەشقی خۆی فڕێدا. ئەگەر چەند ساڵێك لەژیانی ژن ومێردایەتیان تێپەڕی بەم هەستەی خۆی پێدەکەنی‌! پرسیم:

واتا ژیانێکی بێخۆشەویستی دەست پێدەکات؟ دایکم وتی:

بەدبەختی گەنجی ئەمڕۆ ئەمەیە کەشوێن هەودای دڵ دەکەون‌و ژیرانە بیر ناکەنەوە. ئەگەر لەمن دەپرسی ئەوەی شوێنی دڵ دەکەوێ بەدبەخت‌و بێچارەیە پاش هەندێ بێدەنگی وتی:

بەڕاست سەلمان دووجار تەلەفوونی کرد، دەیویست قسەت لەگەڵدا بکات زۆرنیگەرانبووم، وتم چۆتە دیدەنی برادەرێکی نەخۆشی، بەڵام قسەکانی بەشکەوە وەرگرت. هەستە پەیوەندی پێوە بکە بۆئەوەی لەنیگەرانی بێتەدەر. بەدوودڵیەوە دانیشتبووم کەدەنگی لێدانی دەرگاکەهات. هەستام وتم:

دایکە ئەگەر سەلمان بێت تاقەتی چونەدەرەوەم نیە دایکم تووڕەبوو وتی:

هەستە دەرگاکە بکەرەوە لەوانەیە ئەونەبێت کە دەرگاکەم کردەوە سەلمان خۆی بوو. کەدیتمی سلاوی کردو پرسی:

دەکری بڵێی ئەمڕۆ لەکوێ بووی؟ پێکەنیم وتم:

چوبومەسەفەر. بەقسەکەم ڕاچڵەکی وپێی وابوو گاڵتەی پێدەکەم، تۆراو وتی:

دەمبووری، پرسیارێکی بێهۆم کرد. وتم:

دووجـار تەلـەفوونت کـردووەو هـەموو جـاری وەلامـت لـەدایکم وەرکـردووەو هـەموو جـارێکیش دایکـم پێـی وتـی ئـەمڕۆ لـەکوێبووم، بەلام وادیارە قانیع نەبووی کە ئێستا پرسیار لەخۆشم دەکەی؟ وتی:

با، قانیع بووم، بەلام حەزم دەکرد لەزمانی خۆت بمبیستایە دایکم بەرەوپیری هات و وتی:

منیش گـوێم لەقسەکانی سـالومەبوو لێـی مـەتۆرێ، برادەرەکـەی نیگـەران و ناڕەحەتـە قـسەکەی دایکـم سـەلمانی ئـارامکردەوەو بەدایکمی ووت:

یەکەمجاربوو سالومە ئاوا لەگەڵمـدا دەدوا بۆیـە چڵەکیم دیسان بیانووی بۆهێنایەوە من بۆهێنـانی چا لەژوورەکە دەرکەوتم، لـەوەی کەڕەنجابووم، هەم لەسەلمان تووڕە بووم حـەزم دەکـرد بچمە دەرەوە پەنابۆ شوێنێکی ئارام بەرم بیربکەمەوە، بەلام بەبوونی وی لەماڵماندا شـتی وانـەدەکرا کاتێـك چـام هێنـا ئـەو لەگـەڵ دایکمـدا سـەبارەت بەمیوانەکانی ڕۆژی گواستنەوەم قسەی دەکردو دەیووت:

بۆمارەکردنەکە تـەنیا بەتەمەنـەکانی خزمـان بـانگ دەکـەم بۆبـاقی کارەکان کارتی سالۆن بلاو دەکەمەوە. دایکم لەگەڵ ئەم پێشنیازەدا ڕازیبوو سەلمان وتی:

ڕای بنەماڵکـەم ئەوەیـە لەبـەر ئـەوەی ئێـوە تـەنیان. میوانـداری مانـدووتان دەکـات واباشـترە بەڕادەیـەکی کـەم قەناعـەت بکـەین. بەبیـستنی ووشـەی قەناعـەت بـیری سـەفەرەکەم کەوتـەوە بـەخۆمم ووت (ئەگـەر قبـوڵم کـردو لەدەشـتی قەناعـەت مابامـەوە، ئێـستا

کۆلیتەکەمان دروستکردبوو بەدوور لەچاوی خەڵکی لەوێ دەژیاین. ئەوجێگەیەم چەندپێخۆشە لەگەڵ شنەی بادا وەرزش بکەمو بەدەشتەکەدا هەڵپەڕم ئاوی کانیەکان بنۆشم) لەپەنا پەنجەرەکەوە وەستامو سەیری دەرەوەم دەکرد، بەفرێکی وورد دەباری. بەخۆمم ووت (ئایا لەوێش وەرزی پایزو زستان هەیە)

یان هەموو وەرزەکانی بەهارن؟ ! دایکم وتی:

سالومە هۆشت لەکوێیە؟ چایەکەت ساردبۆوە دانیشتم چاکەم خواردەوە سەلمان وتی:

حەزدەکەن بچینەدەرەوە؟ لەوانەیە سەرما بتان هێنێتەوە سەرخۆ سەیری دایکمم کرد ئەوچاوەڕوانی وەڵام بوو؟ وتم:

نا، زۆر مەمنونِ. بەفر دەبارێ تاریکیش بووە واباشترە لێرە وەمێنین دایکیشم قسەکەی پەسەند کردوو لەژوورەکە چۆدەر سەلمان وتی:

دەتوانم ئیشێك بۆ برادەرەکەت بکەم؟ ئەگەر جگە لەنەخۆشی کێشەیەکی هەبێت ئامادەم یارمەتی بدەم. وتم:

نا، کێشەیەکی تایبەتی نیە وتەنیا نەخۆشە، پرسی:

برادەرەکەت هاوکاری ئیداری نیە، نا؟ وتم:

نا ,وتی:

گەرچی چاوم پێی نەکەوتووە بەڵام نیگەرانی تۆ دەبینم ,منیش بۆی نارەحەتم. وتم:

نــــازانم، ئەگـــــەر برادەرەكـــــەم بزانـــــێ دڵـــسۆزی چ دەكـــات. بەسەرسوڕمانەوە چاوی لێكردم، بەڵام هیچ پرسیاری نەكرد. هەر ئەوشـەوە كەوتمـە بـیری ئـەوە ئەگـەر تـەنیا سـەفەر بكـەم ئاغـای سەبووری بەشوێنمدا دێت، بەڵام بیری تەنیای‌و خەم خواردن دایكم پەژیوانی كردمەوە بەخۆم ووت:

ئەگـەر خوشـك یـان برایـەكی دیكـەم شـك ببردایـە دەچـومە ئـەم سـەفەرە، بـەڵام دایـك تـەنیا هـەقی هەیـەو بـەهیوای منـەوە دەژیـت. كەوایـە دەبـێ چـی بكـەم؟ خۆزگـە كەسـێك ڕێنـوێنی دەكـردم خـۆم بەچـــارەنووس ســـپاردوو چـــاوەڕوانی ڕۆژانـــی داهـــاتوو بـــووم. هیواداربووم قەزیەكە بەچەشنێك چارەسەركرابایەو منیش نەجاتم بوایە،

بەدەسپێكردنی مانگی ئاخیری زستان دایكم زۆرتر هەوڵی دەداو یامـەتی خـانمی بۆدەست پێكردنـی ژیـانی نـوێم ئامـادەكرد، بـەڵام ئەوانـە بۆڕواڵـەتی ژیـان بـوون‌و مـن لـەبیری نـاخی ئـەم ژیانـە دڵـم دادەخوریا كاتێك كۆگای كارتۆن‌و پێداویستی ژیانم دەدی، لەدڵمدا هەستم بەپـەژارە دەكـرد دەمزانـی كـاتی دیـاریكردنی چارەنووسـم بەمزوانـە دێـت. وەلـێ دەربازبوونیـشی نـەدەكرا ئاغـای سـەبووری چـــاوەڕوانی بڕیـــاری مـــن بـــوو، منـــیش لـــەنێوان دووڕیـــان‌و سەرلێشێواویدا خەریكبوو دەتوامەوە. شـەوێكیان لەنەبوونی دایكم كـەڵكم وەرگـرت‌و پەیوەنـدیم بـە سـەبووریەوە گـرت. كاتێـك دەنگـم بیست بوغز قوڕگی گرتم، زانی منم بەئارامی پرسی:

چۆنی؟ وتم:

باشنیم ودودڵی خەریکە لەپێم دەخات ئاخێکی کورتی هەڵکێشاو پرسی:

ئیستاش دوودڵی؟ بۆچی بۆلوتکە دوو دڵ نەبووی لێپرسراوبووی بۆچونەسەر، بەڵام ئێستا دەست وپێی خۆت گووم کردوون؟ وتم:

نازانم، لەوانیە چونکە ئەوکات تۆم لەگەڵ دابووی ئاوا سوربووم، بەڵام ئێستا بەبێ تۆ نازانم بڕیار بدەم،

وتی:ئیتر ئەم قسانە مەکە من لەگەڵ تۆ بم یان نەبم گرنگ نیە ئەوە رۆحم لەگەڵ تۆدایە وابزانم هەوادای خۆشەویستیت رزیوە خەریکی پسانە بەتورە ییەوە وتم:

وانیە، من قەتر ناتوانم بی پسێنم، وەرە جارێکی دیکە بچین بۆسەفەرو لەوێ وەمێنین، دەمەوێت هەڵەکەم قەرەبوو بکەمەوە ئەگەر سەفەری ئەورۆژە درێژەی بکێشایە ئێم ەسەرکەوتووبوین و کۆلیتەکەمان دروست کردبوو، لەوانەیە ئێستا تەواویشمان کردبا، هەلوێستەیەکی کردوو وتی:

دروسیتی دەکەم بەڵام نەك بەخەون بەڵکو لەڕاستیدا ئەم کارە دەیکەم پێویستە بڕیاری دوایی بدەی. وتم:

ئەمکارەیدەکەم. وتی:

هەرچی زووترە بیکە بۆئەوەی هەردووکمان لەبێزاری بێینەدەر. من شەورۆژم بەم هیوایەوە تێپەڕکرد کەپێوەندیم بکەی و لەئارامی بڕیارەکەت ئاگادارم بکەی. پرسیم:

گەر نەتوانم لەگەڵتۆدابم چ دەکەی؟ ماویەك بێدەنگ بوو من ناچار بووم لەپشت هێڵەکەوە سەبر بانگی بکەم:

ئاسەف ,ئاسەف ئاخێکی بڵندی هەڵکێشاو دەنگەکەی گەیشتەگوێم و پاشان وتی:

ئێمە بەیەکەوەین تەنانەت ئەگەر بەجەستەش لەگەڵمانەبیت کاتێك تەلەفونەکەم داخست، گریام. حەزم نەدەکرد ژیانی نوێم لەگەڵ کەسێکدا دروستبکەم کەتەنیا خاوەنی لەشی منە بۆ بنیات نانی ژیانێکی هاوبەشی درێژخایەن پێویستە هەموو بوونی خۆمی بۆدانێم. لەخۆم پرسی: (ئایا نیوەی گیانم دەتوانم بژیم وخۆشبەخت بم؟ )قسەی دایکم دەبیست و سەیری ئەم نیشانەم دەکرد کەبەدڵگەرمییەوە بۆی ئەنجام دەدام. دڵ و دیدەی پڕ لەهیواو ئاوات بوو، زمانی بۆ بەیان کردنی قسەی دڵم گرێدەداو بۆئەنجامی هەر کردەوەیەکی پێچەوانە مەیلی ئەو بێ توانای دەکردم. رۆژێك لەکاتی یارمەتیدانیدا پرسیم:

دایکە !ئەگەر رۆژێك هاتوو گووم بووم چ دەکەی؟ بەسەیری لێم راماو پرسی:

مەبەستت چیە؟ وتم:

مەبەستێکم نییە دەمەوێت بزانم ئەگەر رویدا چ دەکەی ؟ وتی:

خۆم دەکووژم. من بێ تۆ توانای ژیانم نیە ئێستا بەقەدەر خۆم خەمبارم و شەوو رۆژ بەخۆم دەڵێم تۆ زۆر لێم دوورنەکەویەوەو من

دەتوانم هەموو ڕۆژێ بێمە دیدەنیت و بەو هیوایەی تۆ نەوەی جوانم بۆ دێنی خۆم دڵخۆش دەکەم. بەدەنگی بەرز پێکەنیم وتم:

دایکە تۆچەند بەخەیاڵ بیر دەکەیەوە. بزۆی لێکنان وتی:

خەیاڵ نیە، ڕاستیە، تۆ دوای گواستنەوە دەبی بە دایك منیش دەبمەخاوەنی نەوە. حەزدەکەم کاتێك چوویە ئیدارە نەوەکەم بێنیە لام. وەك بیلبیلەی چاوم پارێزگاری لێدەکەم هەتا دەگەڕێیەوە. ئاخ سالومە! نازانی چەندە بەئاواتی ئەو ڕۆژەوەم. بەلای خۆمەوە بیرم کردۆتەوە ئەگەر بویە دایکی کوڕێك، ناوی دەنێم عەلیو ئەگەر کچیش بوو ناوی دەنێم سەحەر. ئاواتەکانی دایکم وەپێکەنینی دەخستم و ژیانێکی باش وپڕخۆش گوزەرانی دەهێنایە پێش چاوم. بەهەڵبژاردنی سەلمان دایکم بەئاواتی خۆی دەگەیشت، بەلام خۆم لەدەست دەچووم. حەزم نەدەکرد بەرهەمی تەمەنێك زەحمەتو هەوڵدانی وەلام بدەمەوە. ئەو گەنجیو تەمەنی لەڕێگەی پێگەیاندنی مندا تێپەڕکرد بوو، مافی ئەوەی هەبوو بەئارەزووە کەی بگات. سەلمانیش چەند مانگ چاوەڕوان بوو بۆئەوەی وەك هاوسەری بمباتە ماڵەکەی، هەموو دۆست وناسیاوان چاوەڕوانی بووك و زاوایەتی ئێمە بوون. نەمدەتوانی بۆخۆشی دڵی خۆم ئەوان بڕنجێنم، نا، هۆیکی نیە. بەخۆم ووت :

(سەبووری خۆراگرەو بەهێزەو دەتوانێت خۆی لەبەرژەوەندی ژیان ڕابگرێت، لەوانەشە فەرامۆشم بکاتو ژیانێکی سەرلەنوێ دەست پێ بکاتەوە. تەنیا خۆم دەمێنمەوە بەڕۆح ودڵێکی شکاو دەردە دارەوە

.. ی پەیوەنـــدیم نـــەگرتوو ئـــەوم هـــەروا لەدوودڵیـــدا هێـــشتەوە. ..مدەتوانی پێـی بڵێم چ بڕیارێکم داوە. ئەوبڕیارەی ڕێگـەی ئێمـەی ..ەك جیا دەکردەوە، ئەو ڕۆژەی لـەکڕینی کـەل وپـەلی مارەبڕنەکـە ..ەگەڕاینـەوە، دیـیم بەکوچـەدا تێپـەڕدەبوو. ناچـاربوو ڕاوەسـتێت و ..ەگەڵ هەمووانـدا چاکوخۆشـی بکـات و پیرۆزبـایی لەسـەلمان بکـات. ..ەنگـی نـەدەگیراودەتوت هـیچ پەیوەندیـەك لـەنێوان ئێمـەدا نـەبووە. ..ەنانەت سەیریشی نەکردم. هەستم بەشەرمەزاری و دڵسۆزی دەکـرد، ..ەلام هەوڵمـدا لـەم بیرکردنەوەیـە بێمـەدەرو تێکنەچـم. کاتێـك لێمـان ..با بۆوە سەلمان وتی:

بەخوا پیاوێکی بەڕێزە. دایکم قسەکەی تەئید کردوو دەسـتی کـرد ..ەتاریفکردنی. لەمەراسـیمی مارەکردنەکـەدا بەشـداری نـەکرد، بـەلام ..ەوی گواستنەوەکەم دیم لەلای ئاغای سالاری و نەویـدا دانیشتبوو ..سەی لەگەڵـدا دەکـردن. کاتێـك بۆبـەخێر هێنانیـان نزیـك بوینـەوە، دەسـتی سـەلمانی گـرت وجـارێکی دیکـە پیرۆزبـای لێکـردوو دیـسان سەیری چاونی نەکردم. لەمکاتەدا حەزم دەکرد هەموو سامانی خۆم لەدەسـت بـدەم تـەنیا ئـەو چـاوێکم لـیٚ بکـات. پـێم خۆشـبوو بـەداخ بوونەکـەم لەچـاوانمدا بخوێنێتـەوە، بزانێـت هەڵبـژاردنی سـەلمان بۆئەوەنیـە کەئـەو شـیاو نیـە لەئاسـت مێزەکەیانـدا وێـستابووم و چاوەڕوانی قسە یـان دژکردەوەیـەکی ئـەوم دەکـرد، بـەلام ئـەو سـەری داخستبوو سەیری نەکردم سـەلمان پلـی گـرتم و لەمێزەکـەیان دووری خـستمەوە. کـاتێکی لەسـەر مێزەکـەیان دانیـشتم چـاوم بڕییـە

مێزەکەیان، سەبووری لەگەڵ ئاغای نەویدا قسەی دەکرد چاوی لەوبوو، سەیری هەڵپەڕینی میوانەکانی نەدەکرد، لەماوەی ئەوشەوەدا زۆربەی کات چاوم لە مێزی ئەوان بوو، بەڵام ئەوتاقەجارێك سەرەنجی منی نەدا. بەرەواڵەت شاد بوو، بەڵام نەمدەزانی شادییەکەی ڕواڵەتییە بۆ ئەوەی خەمەکەی داپۆشێت، هەروەك پێکەنینەکانی منیش ڕواڵەتی بوون و شادییان تێدا بەدی نەدەکرا، چەند ڕۆژ دوای گواستنەوەم. دایکم بەستەیەکی بۆهێنامو بەشادییەوە وتی:

ئاغای سەبووری دیاری بۆناردووی. بەپەلەکردمەوە بەدیتنی گلێنەکە بەدەموو چاومەوە نوساند. دایکم وتی:

بەڵێ!دەیزانی ئەوانە زۆر بەنرخن وئەمە باشترین دیارییە کە تائێستا بۆم هاتوون، ئاخ، دایە نازانی چەندە خۆشحاڵم، لەلایەن منەوە بەئاغای سەبووری بڵێ سالومە هەرگیز چاکەی وی فەرامۆش ناکاتو ئەوە کە کلیلی خۆشبەختیت پێ سپارد زۆرت مەمنونە، دایکم بەبێ باوەڕییەوە وتی:

قەت نەمدەزانی گۆزەیەکی گلێنی کلیلی خۆشبەختی بێت !لاچاوم ماچکردو وتم:

ئەم گۆزە گلێنە بچوکە دەمگەیەنێتە خۆشبەختی. ئایا قسەکانم بۆ سەبووری دووپات دەکەیەوە؟ دایکم وتی:

ئەمکارە دەکەم. هەستم دەکرد ئیتر پەژارەم نەماوەو بەبونی ئەو گلێنەیە، هەوردای خۆشەویستیمان بەیەکەوە دەبەسترێتەوە. ئەوشەوە لەخۆشییان خەوم لێنەکەوت. حەزم دەکرد بچم بۆ سەفەرو

لەهەرێمی خۆشبەختیدا چاوم پێی بکەوێت، نیوە شە وهەستام چومە ئەوژورەی گۆزەو پیاڵەکانی لێبوو. بەرگی شیاوم پۆشی وبۆئەوەی ئەگەر لەدەشت یان جادە چاوم کردنەوە ڕیکو پێك بم خۆم بۆ چاوپێکەوتنی ئازیزێك ئامادە دەکردو گۆزەکەم لەزارم نزیك کردەوە چاوم لەسەریەك دانان. بەڵام دڵۆ پێك نەچووە زارمەوە. جارێکی دیکە تاقیمکردەوە، بەڵام ئاکامی نەبوو. ئەسرینی گەرمم بەسەر گۆزەکەدا ڕژاو من سوێری یەکەیانم چێشت، بەخۆمم ووت ئیتر ناتوانم پێ لەو هەرێمە بنێم هێندە گریام کانی چاوانم وشکای داهات و بەلەشێکی ماندوو ڕۆحێکی شکاوەوە پەنام بۆ جێگاکەم برد. خەو لەچاوانم تارا بوو بیرکردنەوەی جۆراوجۆر فشاری بۆمێشکم دەهێنا. بیری ئەوەی ئیتر من ناتوانم لەگەڵ ئەودا هاوسەفەربم، خەم بۆپسانی هەودای خۆشەویستی و ئەوەی ئیتر لەژیانی ویدا دەورێکم نابێت. هێشتا هەتاو نەکەوتوو هەستاتم وجارێکی دیکە تاقیم کردەوە. هیچ ڕوی نەدا. هێندە توورە بوو بووم نزیك بوو گۆزەکەی بەعەرزیدا دەم و وردو خاشی بکەم، بەڵام زوو وەخۆم هاتمەوە بەسەر دڵی خۆمەوە نوساندو وتم:

ئەمە کلیلی هەرێمی خۆشبەختییەو ڕۆژێك دەمگەیەنێتە سەفەر. بەڵێ دەزانم ڕۆژێك لەڕۆژان ئەم گۆزەیە لەگەڵمدا ئاشت دەبێتەوە تێر ئاوم دەکات و من تا ئەو ڕۆژە دەبمە میوانی سەبرو سیکەدانە، ڕۆژبوونە حەوت و حەوتیش بونە مانگ، بەڵام هیچ گۆڕانکارییەك لەگۆزەکەدا ڕوی نەدا بێکەڵك مانەوەی گۆزەکە کزو داماوی کردبووم.

سەلمان و دایکم وشك کەوتبوون بۆئەوەی هۆی کزییەکەم بزانن. من ماندووی بەرپرسیاریێتی ئیشەکەم دەکردە بیانوو، بەلاّم بەجوانی دەمزانی دەیان خەڵەتێنم. ڕۆژێك لەشوێنی کارەکەم بەرەومالّ دەبوومەوە. بەهار لەسەرەتای مانگی سێهەمیدا بوو هەست بەگەرما دەکرا کەچوومە مالّ پەنجەرەکەم کردەوەو چاوم بەدەرگای ماڵەکەی کەوت نیوەکراوەبوو. دلّم داخورپاو بەخۆمم وت:

بێشك چۆتە سەفەرو لەمالّ دەرکەوتووە دەمویست هەڵبێم بۆلای ماڵەکەی، بەلاّم بیرم کردەوە دەورێکم لەژیانی ئەودانیە ڕومکردە دایکم وتی:

دیسان دەرگای مالّی سەبووری کراوەیە دایکم وتی:

لەوانەیە دەوروجیران چوبێتنەلای، کاتێك سەرسوڕمانەکەی منی بینی ووتی:

پووری ئاغای سەبووری دێتە ئەم ماڵەوە. پرسیم:

چۆن سەبووری خانووە کەی بەکرێداوە؟ دایکم وتی:

بەچاکی نازانم، بەلاّم خانمی نەیری دەیوت بەنیازە بۆچەند سالّێك بچێتە سەفەرو نایەوێت مالّکەی چۆڵبێت، ئەوەیە پووری دێتو لەوێدا دەژی، هەستم پێکرد ژوورەکە بەسەرمدا دەسووڕێ. دەستم بەپەنجەرەکە گرت بۆئەوەی نەکەوم. بیستنتی ئەم قسەیە شێواندمیو زانیم ئیتر گەشتێك لەئارادا نابێت دەمویست بگریم بەم هۆیەوە هەندێك خۆم سووك بار بکەم، بەلاّم بەجێگەی ئەوە بێئەوەی بەدایکم بڵێم لەمالّ چوومە دەرەوە زەنگی مالّی سەبووریم لێدا.

هێنـدێك ڕاوەسـتام و چـونك کـەس نـەهات، دەرگـام کـردەوە چـوومە ژوور. هـیچ کەسـی لەحەوشـەدا نـەبوو، لەپـشت دەرگـای دیوەکـە ڕاوەستام وئاغای سەبووریم بانگ کرد، هەیندێکی خایاند تادەرگای دیوەکـە کرایـەوەو ئـەوە دیـار کـەوت. نەمـدەزانی بڵـێم چـی وهـۆی هاتنەکەم چۆن بەیانبکەم، پاش چەند مانگ چاوی لەچاوانم کـرد بەدەنگی لەرزۆك وتی:

بـەخێربێی، بەپەنجـە ئامـاژەی کـرد بـچمە ژوور. بـێ قسە چـوومە ژوور لەسـەر کورسـی گـۆڕین دانیـشتم و بەچـاو لەدەرگاکـە دەگـەڕام بـەلام جێگـەی دەرگـاو قفڵکـە خـاڵی بـوو، ژوورەکـە، ئیتر وەك پێـشوو نـەبوو ببـو بـەژورێکی ئاسـای، تەنانـەت لەسـەر مێزەکـە شمـشێرو گورزەکەی لێنەمابوون، ئاماژەم بەجێگەی دەرگاکە کردو پرسیم؟

دەرگاکە لەکوێیە؟ چیت لێکرد؟ پێکەنی وتی:

لەو جێگەیەدایە کەدەبێ لێی بێ. پرسیم:

بەلام ئەوجێیە لەکوێیە؟ وتی:

نـاتوانم بیلـێم بـەلام دڵنیابـە جێگەکـەی ئەمینـە. بـوغز قـورگی گرتبووم و بەدژواری دەمویست پێشی بارانی ئەسرینم بگرم. وتم:

ڕاستم پێبڵێ. پێم بڵێ چیت لەدەرگاکە کردووە؟ لـەلام ڕۆیـشت و لەکاتێکدا سەیری گوڵی فەرشەکەی دەکرد وەلامیدایەوە:

جێگەکەی ئەمینە، بەلام ناتوانم پێت بڵێم، توورەبووم و پرسیم:

ئێـستا ئـیتر بـروام پێناکـەی؟ بـیرت چـۆتەوە منـیش نهـێنی ئـەو دەرگاریـە شـارەزام و زۆرجـار بـەهێزی ئەودەرگایـە چـوومە سـەفەر؟

بۆیێم نالێی چی رویداوەو چیت لەو دەرگایە کردووە؟ تکات لێدەکەم پێم بڵێ. ئەو دەرگایە تەنیا جێگەی هیوای من بۆ گەیشتنی بە هەرێمی خۆشبەختییە. سەبووری پێکەنی وتی:

بەڵام گۆزەکەت لایە، ئیتر دەرگا بەچ کارێکی تۆدەخوات؟ بۆلای سورام وتم:

شتێکت پێشکەش کردووم لەو رۆژەوە بوومە خاوەنی گلێنە کە زۆرجار نیازی سەفەرم بووە، بەڵام تەنانەت دڵۆ پێکیشم لێنەچەشتووە. دەزانی بۆوای لیّ بەسەر هاتووە؟ ئایا دەتەوێت بەم چەشنە تۆڵەم لیّ بکەیتەوە؟ پێوەندییە کەمان پچڕی؟ چۆن دەتوانی تەنیا ئاواتم لێبسێنی. من خۆشحاڵ بووم هەرجارەی دڵتەنگ بووم دەتوانم بچم بۆسەفەرو لەویّ هەست بەخۆشحاڵی وخۆش بەختی بکەم. هەرگیز باوەڕم نەکرد خۆشەویستیەکە ببێتە دوژمنکاریو بتەویّ تۆڵم لێبکەیەوە !ئەسرینم داباڕین، سەبووری وتی:

ئارامبەو خۆت کۆنترۆڵ بکە، ئەگەر لەم دوونیایەدا تاقە کەسێك هەبێتو من لەبیری تۆڵەیدا نەبم ئەو کەسە تۆی. من چۆن دەتوانم ئازارت بدەم دەبیّ تائەم ڕادەیە لەمرۆڤایەتی دوور کەوتبمەوە؟ وتم:

کەوایە پێم بڵیّ بەمرۆڤایەتی سوێندت دەدەم، بەپیاوەتیو هەرچی بڕوات پێیەتی، پێم بڵی گ زەکەم بۆئاوا بێکەڵك بووەو من ناتوانم بچمە سەفەر سەیری چاوە ئەسریناویەکانی کردمو وتی: لەبەر ئەوەی تۆ ڕێگەت لەمن جیبیا کردەوە چونکی تۆ جوتی من نیو هی خەڵکی دیکەی. ئەو رۆژە دەتوانی بەدەرگاکەدا تێپەڕبی،

هاوسـەفەری مـن بـووی، کـە چـارەنووسمان بەیەکـەوە گرێـدرابوو. تێدەپەڕی، بەڵام تۆ ڕێگەی خۆت لەمن جیا کردەوەو دەبێ ئەم مافەم پێبـدەی بەتەنیایـدا تێپـەڕبم و بـچم بۆسـەفەر، گلێنەکـە تائەوکاتـەی لەپەنا دەرگای خۆش بەختی بوو تایبەتمەندی خۆی هـەبوو، چونکە هێـزی عەشـق پـڕی دەکـرد، بـەڵام ئێـستا بەتاڵـەو ئـیتر عەشـقێك لـە ئارادانیە بۆ ئەوەی بڕی بکات، دەرگاکەش بۆپێدا چوون‌و گەیشتن بە خۆشـبەختی بـوو تـۆ ئێـستا پێـی گەیـشتووی ئـیتر چـیت دەوێ؟. ئـەوەمنم کـە دەبـێ بـەم دەرگایـەدا بـڕۆم بۆئـەوەی خۆشـبەختی خـۆم بدۆزمەوە، دەزانم نەلەدەشتی قەناعەت‌و نەلە هیچ لوتکەیەکدا ناگەمە خۆشـبەختی، تـۆ زۆر ئاسـانتر وەدەسـتت خـست کەوایـە بیپـارێزەو خۆشبەخت بە.

تۆ لەماوەی ژیان تێری ! وتم:

من تائێستاش بەشوێن خۆشبەختیدا وێڵم‌و خۆم بەتینوی دەبینم. سەبووری راماو سەیری خاڵێکی دووری دەکرد وتی:

قانیع بەو لەزیـدە خـوازی چـاوت بپۆشـە، تائـەم بیرەت لەگەڵـدابێت لەهیچ کوێیـەك هەسـت بەخۆشـبەختی ناکەی، ڕێگەمـەدە هـیچ کـەس وەك ئـەو دووپرێژنـە بەلاتـدا تێپـەڕبن. لەگـەڵ شـووەکەت ڕێکـەوەو کـۆلیتی عەشـــقی لەگەڵـــدا دروســـت بکـــە، بۆئـــەوەی بزانـــی کـــە خۆشگوزەرانی واتا خۆشەویستی، لەگەڵ یەکتر بوون لەپـەنا یـەکتردا چێژوەرگرتن. مـن بـەیادی ئەوخۆشەوەیستیە بەقیـسمەت بـوو، خـۆم دڵخـۆش دەکـەم‌و لەگـەڵ بیرەوەریـە خۆشـەکانی ئەوسـاتە وەختانـەوە

ژیان دەکەم. قەناعەتم کردۆتە پیشەی خۆم ڕازیم. هەستە بگەڕێوە بۆلای مێردەکەت و خۆشبەختی لەلای ئەو بەدەست بخە، منیش لەدەشتی قەناعەتدا کۆلیتەکم دروست دەکەم، ناوەکەی بەیادی تۆوە لێدەنێم، پەردە لەپەنجەرەکانی هەڵدەواسم بۆئەوەی کەس نەتوانێت سەیری ناوەوەی بکات و لەوێدا پیاوێك ببینێت کە بەبیری ڕۆژانی خۆشی گەشتەکەی ژیان تێپەڕدەکات، من دەگەڕێمەوە بۆ دەشت و لەوێدا دەژیم، هەستاو وتی:

هەودای خۆشەویستی مەحکەمەو ناپسێت، من هەمیشە لەهەر شوێنێك بم بەیادبی تۆوە دەژیم لەکەنار دەرگاکە ڕاوەستام وتم:

ئەگەر ئەمە لە دوادیداری ئێمەیە حەزدەکەم شتێکم بدەیتێ کەلات زۆر خۆشەویستە. دەمەوێت بەسەیرکردنی بکەومەوە بیری تۆوەو فەرامۆشت نەکەم و منیش چەند ڕۆژێك لەهەرێمی خۆشەویستیدا ژیام ولەگەڵ یەکێك دابووم قەت لەعیشق وخۆشەویستی خۆی نەدواو بووبەهۆی لەناوچونی ژیانم. ماوەیەك بەبێدەنگی تێپەڕبوو پاشان وتی:

تاوێك ڕاوەستەو بەتەنیا جێی هێشتم و گەڕایەوە ژوورەکەی وکاتێك هاتەوەحەوشە هەیکەلی ئەسپی بەدەستەوەبوو. بەرامبەرم وەستاو هەردوو دەستی بۆلام درێژ کردم، پارچە چەرمێکی بەدەستەکەی دیکەوە بوو کەدەمزانی ڕسمی دەمووچاوی منە. سەبووری وتی:

هەردووکیان شتی بەنرخن هەرکامەیانت حەزلێیە هەڵی بگرە.

ئەسپی باڵدارم هەڵگرت وتم:

ئەمەیان هەڵدەگرم ئێستا کەناتوانم بەبەر دەرگاکەتا بڕۆم لەوانەیە بتوانم بەسەر باڵی ئەم ئەسپەدا بفڕم و بگەمە هەرێمی خۆشبەختی.

بزەیەکی کردو وتی:

خۆشبەخت بی. بەئەسپە باڵدارەکەوە چوومەوە بۆماڵ ئەسپەکەم لەپەنا گڵێنەکە داناو پاشان بەم هیوایەوە کەئەسپە باڵدارەکە دەمبات بۆ سەفەر، ڕۆژگارم تێپەڕکرد. بەدوای یەکدا تێدەپەڕین بێ ئەوەی گۆرانێك لەژیانمدا پێك بێت، سەلمان ئەخلاقی گۆڕابوو توورە ببوو، ژیانی بێ جووڵەی ئێمە هۆی ئەم گۆڕانەی سەلمان بوو، بێدەنگی باڵی بەسەر ماڵەکەدا کێشابوو بێدەنگی وگۆشەگیری من ئەوی لاوازکردبوو. کاتێکی دەگەڕاینەوە بۆماڵ هیچ شتێك نەدەبووە مایەی خۆشحاڵیمان. تەنانەت ئەوکاتەی بۆدەربازبوون لەتەنیای لەدەرەوەی ماڵبووم. دیسان خۆم بەتەنیای دەدیەوە. هیچمان قسەیەکمان بۆ کردن نەبوو، دایکم وبنەماڵەی سەلمان چاوەڕوانی منداڵی ئێمە بوونو دایکم زیاتر بەپەلە بوو، نیگەرانیو هۆگری لەچاوانیدا بەدی دەکرا. کاتێك لەسەر پێشنیازی دایکم چووینە لای دکتۆر. وەڵامی فەحسەکان دایکمی لەپێ خستو هیواو ئاواتەکانی ببونە بڵقی سەر ئاو، کەم وکوڕی لای سەلمانەوە نەبوو، ئەوەمن بووم نەمدەتوانی منداڵم بێت. ئەمە سەلمانی تەواو لەپێخست بوو، وەك مرۆڤێکی توورە و شێتی لێهات بوو،؟ قسەکانی دەروونی ڕزاندبوومو لەناوی دەبردم. بۆپاراستنی ڕواڵەتی خۆشبەختیەکەم، هەوڵم دەدا شێوەی

ژیانەکەم بگۆڕم وسەلمان بۆخۆم رابگرم. بەلاّم ئیتر زۆر درەنگتر بوو. تا ئەو تەشەرەکانی ئاگری لەدلّم بەردەدا. بەلاّم نەمدەتوانی فزەیەك بکەم، کاتێك شەوانە دەهاتەوە بۆماڵ. زەنگی مەترسیە کەم هەست پێدەکردو لەگەڵیدا دەستم بەوت و وێژ دەکرد. پێشنیازم پێکرد منالێك وەربگرم بەخێوی بکەم بەلاّم بەم پێشنیازە پێکەنی وتی:

تۆچیت هەیە بیدەی بەم منالە گوناهە؟ دەتەوێت ئەویش بێچارە بکەی؟ نا،گیانە !ڕازی بەم جینایەتیە نیم. گریام وتم:

بەلاّم من دەتوانم تۆش چێژی باوك بوون وەردەگری. ئەمجارەیان بەدەنگی بەرز پێکەنی وتی:

منالّی من دایکی شێتی ناوێ. وادەزانی نازانم و نەمدیوە شەوێ ئەسپی بالّدار لەڕوبەڕوی خۆت دادەنێی و وەك جادوو گەران لێی ڕادەمێنی و لەگۆزە خالّییەکە ئاو دەنۆشی. شێت بازییەکانت ماندووی کردوم. من بەنیازم ژن بێنم لەژنێکی ژیرو ساغ ببمە خاوەنی منالّ ئەگەر دەتوانی هەڵبکەی بمێنەوە لەگەڵ ئەو ئەشیایانەی لەگیان خۆشەویستترن ژیان بەسەر بەرە، ئەگەر نا پێویستە لێك جیا بینەوە. بیری تەلاّق هێندەی تر تێکی دام، هاوارم گەییە ئاسمان وتم:

ناتوانی بەم چەشنە هەڵسو کەوت بکەی. ئیزن نادەم پێم بلێی شێت و لەماق خۆم بێبەریم بکەی. لەگەڵت دێمە لای دکتۆر بۆئەوەی بزانی شێتم یان ئاقلّ. وتی:

هاوار مەکە لەقیزەی تۆ ناترسم، من قسەی دوایم کردوو ماف هەڵبژاردن بەدەست خۆتە، دانیشتم و بیرم کردەوە ئەمە دووهەمجارە کەرێگەی خۆم هەڵبژێرم. لەهەڵبژاردنی یەکەمدا دووچاری هەڵەبووم، بەلام ئەمجارەیان پێویستە کام رێگەیە هەڵبژێرم، کە لەلای ئەو جادووگەرو شێت بم، بەشەرەفمەندییەوە بگەڕامایەوە ماڵی دایکم. دەمتوانی پێم بڵێن ژنێکی نەزۆکو قبوڵی بکەم؟ بەلام ناونیشانی شێت بوونم هەرگیز قبوڵ نەدەکرا، پێشنیازی دووهەمم پەسەندکردو بەئارامی جیابووینەوە. ئارامییەك دەروونی شێواندم من هەمیشە ئەم شێواویەم لەدەرونمدا رادەگرت و زیاتر دەتوامەوە. کاتێك گەرامەوە ماڵی دایکم هەر پێست وئێسقانم لێ مابۆوە، دەورو جیران زگیان پێدە سووتامو دایکم بەدزییەوە بەدوور لەچاوی من ئەسرینی دەباراند. تێکشکان لەژیانی ژن ومێردایەتیدا لەلایەكو لەلایەکی ترەوە چاوسوور کردنەوەکانی دایکم و نیگای دڵسۆزانەی دراوسێکان برد بوومیە سنووری شێتیەوە بەراست هێندەشم مەودا لەگەڵ شێتیدا نەبوو، بۆئەوەی سەلمان نەبینم ناچاربووم دەست لەکاری ئیداری هەڵگرم و خانەنشین بم دابینکردنی خەرجی بەرێوەچوون دژوار بوو ژیانمان بەزەحمەت تێپەڕ دەبوو، حەزمدەکرد ئیشێکی دیکە بکەم بۆئەوەی لەگەڵ دایکمدا بتوانین وەك رابردوو بژین، بەلام فشاری دەروونی هێزی کارکردنی لێبریبووم وپێویستە ماوەیەك تێپەر بێت بۆ ئەوەی بتوانم شوێن ئیشێکی دیکە بکەوم. دایکم هاموشۆی پووری ئاغای سەبووری کردوو لەم رەوشە

دەرونیەی من تێی دا بووم، هاتنی پووری سەبووری بۆلای دایکم، نارەحەتییەکەی زیاتر دەکردم. دەمدی ئەوبەئازادی لەوماڵەدا دێت و دەچێتو بەبێ گوێدان بەبوونی سەبووری لەوێدا ژیانی تیپەر دەکرد. جارێکی لێم پرسی:

ئاگات لێیە، ئاغای سەبووری لەکوێیە؟ بەلالوتێکەوە شانی داچەکاندو وتی:

لەشوێنێکی دیاریکراونیە، جاری وایە لەشیرازوو جاری وایە لە(تەبەس)ە جاری وایە سەری لە( شووستەر) دەهێنێتەدەر، بەڵام تازە بیستومە چۆتەباکوور. ناسیاوێکمان دەیگووت لە (سەوداکۆ) دیوەیەتی. وابزانم لەدارستانەکانی ئەوێ کار دەکات. خوا دەزانێت لەوێ لەچی دەگەڕێت؟ بیرم کردەوە بەشوێن خۆشبەختیدا دەگەڕێت. پوورە خانم قسەکەی بیستم وتی:

ئایا دوزینەوەی چەند گۆزەی شکاو هێندەی بروسک خۆشبەختیە؟ نا گیانە، ئەوبەشوێن خەزنەدا دەگەڕیّو حەزدەکات لەم ڕێگەیەوە سامن داربێ. لەقسەکەی توورەبووم وتم:

خەزنە تەنیا دۆزینەوەی سکەی زێرنیە، هەرچی لەژیانی رابردووەکان دەستکەوێتو ئاگادری ئێمە زیاتر بکات خەزێنەیە، پوورە خانم پێکەنی وتی:

گریمان کردمانو زانیمان، دەبێتەچی؟ ئەوان ڕۆژگارێك لەسەر ئەم زەوییە ژیاون وپاشان ڕۆیشتوون. ئێستا ئێمە گەنجی خۆمان تێك دەدەین بۆئەوەی شێوەی ژیانی ئەوان ئاگاداربین؟ من دەڵێم ئەم

ئیشە بەفیرۆ دانی ژیانە. ئاسەف، گەنجییەتیەکەی لەم ڕێگەیەوە دەست دەدات‌و خۆی دەبێتە عەنتیکە بەبوغزو رقەوە وتم:

خۆزگەم بەخۆت دەبییە پووری برازایەکی عەنتیکە. قسەکەی بەگاڵتە زانی وپێکەنی بیری چوونە باکوور ئارامی لێ بڕی بووم، حەزم دەکرد لەدوورەوە سەیری ئیشەکەیم کردبا،ئەم بیرە چەند شەوێك خەوی لێ هەراسان کردبووم ڕۆژێکی بەم بڕیارەوە لەجێ هاتمە دەرەوە بەدایکم ووت:

دەمەوێت ڕۆژێك بچم بۆسەفەر. ئەم قسەیە بووە مایەی شادی ئەوو وتی:

فیکرێکی زۆر باشە، گۆڕینی کەش وهەوا بۆهاتنە سەر خۆت پێویستە. ئەگەر پێت خۆش بێت منیش لە گەڵت دادێم، وتم:

نا، حەزدەکەم تەنیا بچم. دەبێت خۆم ئەزموون بکەم ئاخۆ دەتوانم بە ئیشێکەوە سەرقاڵبم یان نا؟ دایکم دەستی بەسەرمدا هێنا وتی:

دەتوانی، بەڵێنت پێدەدەم کەگەرایەوە وەك پێشوو خۆشحاڵ ولەسەرخۆی. ئەوڕۆ دەچیٚ یان سبەینیٚ؟ وتم:

ئەمڕۆ ڕێدەکەوم‌و دەچم بۆباکوور. دایکم جانتاکەی بۆبەستم‌و بەدووعا بەڕێی کردم، کەسواربووم توشی دڵە خورپە بووم، بەخۆمم وت ئەگەر ئەو لە سەوادکۆ دەرچووبێت، لەکویٚ بیدۆزمەوە. جادەی سەر سەوزی باکوور خستمیە بیری هەرێمی خۆش بەختییەوە و چوومەوە خەیاڵاتیەوە. تەمومژێك دۆڵەکەی داگرتبوو بۆنی گژوگیا مرۆڤی سەرمەست دەکرد. خانوەکانی بناری کێوەکەو شوان‌و

ڕانەمەڕەکانی هێندەکاری تێکردم، ئارەزووم دەکرد خۆزگە لەم دۆڵە سەوزو جوانەدا ژیابام و لەشارو قەرەباڵغی دووربام. لەسەوداکۆ دابەزیم ناونیشانەکەم لەپیاوێکی گووندی پرسیار کرد. ووتی نازانمو پرسیار لەئیدارەی پاراستنی دارستان بکە. لەوێش کەس ئاگادار نەبوو بەبێ هیوایی لەوێ هاتمە دەرەوە نەمدەزانی لەکوێوە گەڕان دەستپێبکەم. بەخۆشییەوە ئەوپیرە پیاوەی هەوەڵی دیم، کەسەیریکرد بەماتی لەقەراغ جادەکە وێستاوم هات ولێی پرسیم:

توانیت بیان دۆزیەوە؟ وتم:

بەداخەوە نا، لەوانەیە لێرە ڕۆیشتبن بەلاّم بۆکوێ؟ نازانم. وتی:

باشە لەخوودی ئیدارەی شوێنەوار پرسیار بکە. بێشك پێت دەڵێن وتم:

ئەوەی من بەشوێنیدا دەگەڕێم لەوانەیە لەتاقمەکەی جیا بووبێتەوە خۆی بەتەنیا لێرەمابێتەوە. پیرە پیاوەکە هێندێ بیری کردوە پاشان پرسی:

ئەو پیاوەی بەشوێنی دا دەگەڕێ بالاّبەرزو چوار شانەیە؟ وتم:

ئەم نیشانانە لەگەڵیدا ڕێك دەکەون، بەلاّم لەوانەیە ئەونەبێت. پیرە پاوەکەش تەئکیدی کردەوە وتی:

بەڵێ، لەوانەیە ئەوپیاوەی چەند مانگ بەر لەئێستا لەنێو دارستانەدا کۆلیتێکی دروست کردبوو، ئەونەبێت. بەبیستنی ئەم قسەیە خۆشحاڵبووم وتم:

خۆیەتی !پیرە پیاوەکە بزەیەکی کردوو درێژەی پێدا:

زۆر هیـوادار مەبـە، بـەڵام خـەراپ نیـە بـەرەو ڕوبـی، ئەوخـەڵکی ئێرەنیە پیاوێکی زۆر بێدەنگ وئارامە، وتم:

ئێستا ئیتر سوور دەزانم ئـەوە، ئەگـەر دەکرێ جێگەکـەیم نیشان بدەی دەترسم لـەنێو دارسـتانەکەدا گووم بم، پیرە پیـاوەك بـەدەنگی بەرز پێکەنی وتی:

کۆلیتەکـــەی لەباشـــترین شـــوێنی دارســـتانەکەدایە، دەبـــینی !بەڕێنوێنی پێم نایە نێو دارستانەکەو بەڕیگەیەکدا کەلە نێو دڵیدا درەخـتی بـەرز دروسـت کرابـوو تێپـەڕبووم، تیشکی ڕۆژبـە درزییـەوە لـەنێو لـق وپۆپەکانـدا لـەزەوی دەدا. هێنامەیـە سـەر ئەوبڕوایـە کەهەڵوێـستەیەك بکـەم، پـیرە پیاوەکـە مـنی بـینی چـوومە نێـو خەیاڵتەوە، ڕاوەستاو وتی:

وەرە بابڕۆین لێرە هەوا زوو تاریك دەبێت. لەگەڵیدا ڕیکەوتم،

لەنێو دارستانەکەدا پێمان نایە شوێنێکی ئاواڵەوە کەکوالیتی لێ دروستکرابوو بەدیتنی دڵم وەلەرزکەوت وپێی ڕۆیشتنم نـەبوو پیرە پیاوەکە ئاماژەی بە کۆلیتەکە کرد وتی:

ئێرەیە. بەدەنگێکی لەرزۆکەوە وتم:

مەمنوونم ڕێنوێنیت کردمم. وتی:

ئەگـەر چـووی ئـەوپیاوە نـەبوو لێـی دەگەڕیێ،ماڵـەوە لـەخوار ئـەم ڕووبارەوەیـــە، ئەگـــەر هێنـــدێك هاتیـــە خـــوار دەیدۆزییـــەوە، نـــاوم حەیدەرە. جاریکی دیکە سوپاسم کردوو ئەودرێژەی بەڕیگەکەی دا. بـــەترس و لـــەرزەوە چـــوومە لای کۆلیتەکـــە. پەنجەرەکـــە پـــەردەی

پیوەنەبوو دەکرا ژوورەکەی ببینی. خۆم گەیاندە پشت پەنجەرەکە بەدزییەوە سەیری ژوورەکەم کرد. لەپشتەوە دیم لەسەر کورسی دانیشتبوو. حەزمدەکرد بمدیایە خەریکی چییە. هێندە ڕاوەستام هەتا لەسەر کورسییەکەی هەستا ولەم کاتەدا دییم قاپە وێنەیەکی پێیە لەسەر دیوارەکەی داناو سەیری دەکرد، نەمدەتوانی ئیتر سەیری بکەم، بەئارامی دەرگای کۆلیتەکەم کردەوە. پێی زانی بۆلای دەرگاکە سوورِا. کاتێکی دیمی بەناوەرییەوە چاوی چووك کردن و لەژێر لێوانیەوە وتی:

خوای من، درووست دەبینم؟ پێم نایە کۆلیتەکەوە وتم:

من هاتوومە سەفەر،بەلاّم ئەمجارەیان بەڕاست، نایەی بەخێرهاتنی میوانەکەت بکەی؟ بەرەولام هاتو وتی:

ئێستاش بڕواناکەم تۆ لێرەی. قەدەرێك پێش ئێستا سەیری وێنەکەتم دەکردوو بەخۆمم دەوت ((داخوا خواوەند هێندە عومرم دەداتێ بۆئەوەی جاێکی دیکە بتبینمەوە، لەم بیر کردنەوەیەدا بووم تۆ لەدەرگاتدا. پێم بڵێ چۆنت دۆزیمەوە لەکوێ زانیت لێرەم؟ دانیشتم وتم: هەودای خۆشەویستیم گرت وخۆم گەیاندە ئێرە.

وتی: خۆشحاڵم ئەمجارەیان هەودایەکت باش هەڵبژارد، وتم:

ڕاستم هەڵبژاردووە، بەلاّم نازانم سەرەکەی دیکەی ئێستاش وەسڵە یاخورد نا؟ سەبووری بەدەنگی بەرز پێکەنی وتی:

وەسڵە، کچەکە گیان، وەسڵە !ئەگەر من پێوەندی خۆم پساندبا ئێستا لێرە نەبووم، ئێمە هەردوکمان سەفەرێکی دژوارمان

تێپەڕکردووەو ئێستا کاتی ئەوەیە لەهەرێمی خۆشبەختیدا ژیان بکەین. پێوەندیەکەمان ئەبەدی دەبێتو قەت ناپسێت.

هەردووکمان ئەسرین بەچاوماندا شۆڕبۆوە. یەکێکمان وتی:

مرواری چاوانم لەسەدەف گیانم تاشراون دەیانکەمە ملی تۆوە.

کۆتایی

# HAMİŞE LEGEL TODA



فەهیمەی رەحیمی

سڵاو لە یاران

پەیامی دڵ بزوێنت گەیشتە لام

ماچم کرد و نامە سەر دیدەی گریانمەوە

لە ترسی ئەوەی لافاوی ئەسرینم بیشواتەوە

لەسەر دیدە هەڵمگرت و لەسەر گیانم دانا






لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ ( 2500 ) دینار